دەزگەها سپیرێز یاچاپ و وەشانێ

دار سپيريز للطباعة و النشر
SPIREZ PRESS & PUBLISHER

خودانێ ئمتیازێ: حافظ قاضي
سەرنڤیسەر: مؤيد طيب

* ژمارا كتێبێ (٣٨)
* جگەرخوین ...شاعر و مرۆڤ و كوردپەروەر
* ڤەگوهاستن و بەرهەڤكرن : هەڤال زاخۆیی
* دەرهێنانا هونەری : هەكار فندی
* بەرگ: بەیار جەمیل
* تیپچنین: بەسنا محەمەد سالح
* سەرپەرشتیاریێ چاپكرنێ: زاگرۆس مەحمود
* چاپا ئێكێ
* ژمارا سپاردنێ: (٤٢) سالا ٢٠٠٤
* چاپخانە: وەزارەتا پەروەردێ ـ هەولێر
* تیراژ: (٥٠٠) دانە



كوردستانا عیراقێ . دهوك
ئاڤاهیێ سەندیكا كرێكارێن كوردستانێ ـ قاتێ سێیەم
www.spirez.net 7222125 - 7225376 : تەلەفون

# جگەرخوین

## شاعر و مرۆڤ و کوردپەروەر

ڤەگوهاستن و بەرهەڤکرن
هەڤال زاخۆیی

سپیرێز دهۆک 2004

# ژ ئیلهاما جگەرخوین

**ژ گیانێ پاکێ سەیدا جگەرخوین را دیارییە**

ژ دەردێ ڤێ دلبەرێ، ئیرۆ پر کوڤانە دل
ژ ئەڤینا ئەسمەرێ، ئیرۆ پەریشانە دل

پەریشان وبێزارم، پری دەرد و ژانە دل
بێ هوش وگران بارم، ئێخسیرێ چاڤانە دل

چەند سالن ل بەندێ مە، ئیرۆ بێ سەمیانە دل
چاڤەرێی وێ روژێ مە، کەنگی بشەهیانە دل

ژ ئیلهاما جگەرخوین، ئیرو دێ گەش بت ئەڤ دل
سەیدا، ئالا هات هلدان، لەو ئیرو مەستانە دل

خەونا تە ئیرۆ بوو راست، بکەنی و دیلانە دل
دیلانا دلێ تەیە، ژ رەنگێ ئالانە دل

هەڤال زاخۆیی
2-10-2003
دهوک

دیاری
بۆ گیانیێ پاکێ هەلبەستڤانیێ مەزن
جگەرخوین

# پەیڤەک پێدڤی

ژمێژ وەرە ئۆمێدا من بوویە ئەز بکاربم هەمی بەرهەمێ هەلبەستڤانێ مەزنێ کورد "جگەرخوین"ی ڤەگوهێزمە پیتێن عەرەبی، ژ بەرکو پرانیا خوەندڤانان ل باشورێ کوردستانێ ئانکو پارچەیا رزگارکری ژ کوردستانێ بپیتێن عەرەبی دخوینن، بەلکو ژی من وەک کەسەک خوەندەڤان باوەری بگوتنەک ماموستایێ هەلبەستڤان "مؤید طیب" ئانییە دەما لجڤاتەک تایبەت گوتی "کەسێ زمانێ کوردی بپیتێن عەرەبی نەخوینت ئەوی نێڤ روشنبیریا کوردی نەنیاسیە و بەرووڤاژی، ئانکو ئەو رۆشنبیری کورد یێ کو بپیتێن "لاتینی" ژی نەخوینت ئەویژی نیڤ روشنبیریا کوردی بپاش گوهڤە لێدایە.

ئارمانجا من ئەو بوویە کو ئەز تەڤ بەرهەمێ ڤی هەلبەستڤان و رۆشنبیرێ مەزنێ کورد ڤەگوهێزم پیتێن عەرەبی، لێ مژوول بوونا من بکارێ رۆژنامەڤانیڤە و هەر وەها نەپەیدابوونا شیانێن دراڤی بووینە ئەگەر کو هەیا نها من ئەڤ پرۆژەیە وەک خەون دیتیە.

ئەگەرەک گرنگ ئەز پالدایە ڤی رەنگە پرۆژەی بکمە دهزرا خوەدا، ئەوژی براستی چ گرنگی پێدان ببەرهەمێ جگەرخوینێ مەزن نەهاتیە کرن نەژئالیێ دەزگەهێن رۆشنبیری ڤە ل هەرێما کوردستانێ و نەژئالیێ رۆشنبیران ڤەژی،

بەلكو دەلیڤە لڤر دەستویریێ نادە ئەز هنەک ژ وان ئەگەران بدم بەرچاڤ ئێن کو بووینە ئاستەنگ دڤێ رێدە، هەرچەندە ژی تەڤ سیاسەتڤان وروشنبیرێن کورد باش و باش دزانن جگەرخوین کییە و چییە و چ کریە، ئەز بخوەژی وەک کەسەک خوەندەڤان ڤی هەلبەستڤانی دبینم یەک ژ گرنگترین کەسایەتیێن روشنبیریا کوردی دچەرخێ بیستێدا کو ئەوی بدەهان مرید پەیداکرینە و کارتێکرنەک پوزەتیڤ لسەر گەلەک گەنجێن کورد هەبوویە کو بەر بجیهانا هەلبەستێڤە بچن و هەر وەها کارتێکرنەک مەزن لسەر گەلەک گەنجان هەبوویە کو خوەدی لدۆزا مللەتێ خوە دەرکەڤن و بەرێ خوە بدنە هەڤرکییا دژمنان...

لداوییا ڤێ پەیڤێ ژی سوپاسییێن خوە ئاراستەی دەزگەها سپیرێز یا چاپ و وەشانانان دکم وبتایبەت رێڤەبەرێ وی ماموستا "مؤید طیب" کو بۆ من بوویە پالدەر ئەز قەفتەک ژ هەلبەستێن جگەرخوینی بپیتێن عەرەبی دانم بەرچاڤێ خوەندەڤانان.

**هەڤال زاخۆیی**
**1-12-2003**

# جگەرخوین... ژیان و داهێنان

ناڤێ وی یێ دورست "شێخ موس مەلا حسن"ە ل سالا 1903ل گوندێ "هەسار" سەر بقەزا "مێردین"ی ڤە ل باکورێ کوردستانێ ژ مالباتەک هەژار هاتیە دنێ، وهێشتا جگەرخوین زارۆک بابێ وی بارکریە و چوویە بەر دلوڤانیا خودێ، ئەڤجا جگەرخوین بێ کەس مایە، تەنێ برایێ وی یێ مەزن هنەک هاریکاری پێرە کریە وپاشی ئەو نەچار بوویە لجەم گوندیێن دەولەمەند و ئاغایان کار بکە و خزمەتکاریێ بکە و دوی ژیێ زارۆکینی دە جگەرخوین کەتە ژێر ستەمێ و زۆر دەستییێ.

ژ بەر نەچاری و هەژاریێ مینا گەلەک هەڤدەمێن خوە، جگەرخوین نکاربوو ل خوەندنگەهان بخوینە، لێ ل ژیێ 18 سالیێ لبەر دەستێ مەلا دەست بخوەندنا ئایینی کریە.

جگەرخوین بخوەندنێڤە و خواستنا زانستی هاتە گرێدان و حەز و ڤیانا پیشدەچوون و رۆناکبیریێ کەتە دلێ وی و ژ بەر ڤێ یەکی ل گەلەک جها گەریان کر، لێ ئەو لسنوورێ خواندنا ئایینی نەراوەستا بەلکو وی دیفچوونا تشتەک دن کر ئەوژی خواندنا بەرهەمێن ئەدەبی یێن کوردی مینا بەرهەمی

جزیری و خانی و فەقییێ تەیران و هنەکێن دن، زوو بزوو بسەر ئێش و ئازارێن وەلات و مللەتێ خوە هلبوویە.
پشتی کو خواندنا خوە یا ئایینی بداوی ئانی ل گوندەکی ل کوردستانا سوریی کارێ" مەلاتی" کر ئانکو بوویە مەلا، لێ ددەمەک کورت دا ئەوی ببیر و باوەرییێن پێشکەتی لوی سەردەمی خوە دا ناسکرن و هەر زوو دژی شێخ و مەلا و ئاغان کارکر وئارمانجا خوە کرە رووت کرنا وان و رەفتارێن وان یێن دپشت پەردا ئایینێ دە دکرن و بوێ یەکێ زولم و ستەمکارییەک مەزن لخەلکێ خوەدکرن.
ل سالا 1925 وپشتی شکەستنا سەرهلدانا شێخ سەعیدێ پیران گەلەک بیرەوەر و وەلاتپارێزێن کورد ژ باکورێ کوردستانێ بەر بکوردستانا سوریێ ڤە هاتن و ئەوان ل سالا 1927 کومەلەک بناڤێ کومەلا خۆیبوون دامەزراندن و جگەرخوین ژی یەک ژ دامەزرینەرێن ڤێ کومەلی بوویە و دەست پێکر دکوڤارا "هاوار"دە هەلبەستێن خوە لژێر ناڤێ جگەرخوین وەشاندن، و ددەمەک کورت دا ل گەلەک دەڤەرین کوردستانێ ناڤێ جگەرخوین هاتە ناسکرن ژ بەرکو هەلبەستێن وی پر بوون ژ هەست و گیانێ وەلاتپارێزیێ.
د بوویەرێن شەرێ دووەم یێ جیهانیدا جگەرخوین دەرباس بوو و ڤان بوویەر و ئەنجامێن شەری کارتێرکرنەک مەزن لجگەرخوینی کرن و ئەو بەر بهزرو بیرین سوسیالیزم ڤە چوو زێدەباری وەلاتپارێزی و گرێدانا وی بنەتەوا کورد ڤە.
ل سالا 1950 ل کوردستانا سوریێ پارتیا دیموکراتا کورد دهێتە دامەزراندن، جگەرخوین ژی بوویە یەک ژ ئەندامێن ڤێ پارتیێ و هەتا مرنا خوەژی یەک بوویە ژ ئەندامێن وێ.
پشتی روخاندنا سیستەمی شاهانی ئانکو "ملکی" ل عیراقی ژ ئەنجامێ کودەتایا عبدالکریم قاسم ل تیرمەها 1958، جگەرخوینی قەستا کوردستانا عیراقێ کر ولپشکا کوردی ل کولیجا ئادابێ ل زانکویا بەغدا بوویە ماموستاییێ زمان و ئەدەبێ کوردی، لێ ل سالا 1961 شورەشا ئیلونا مەزن دەست پێدکەت و ئەوژی قەستا شورەشێ دکەت و هەمی شیانێن خوە ژ بو فێرکرن و رۆشنبیرکرنا کادر و پێشمەرگەیێن پارتی تەرخان دکەت.
پشتی سالا 1970 جگەرخوین دیسا بەر بکوردستانا سوریێ چوویە، لێ ل وێ دەرێ توشی گەلەک ئاستەنگ و گرفتاریان دبە ژ ئالیی بەعسا سوری ڤە

و چەند سال دزیندان وگرتناڤە دەربازکرن هەتا کو سالا 1979 بەر بوەلاتێ سوید ڤە چوویە ولوێ دەرێ بوویە پەنابەر هەتا 22-11-1984 بیەک جاری ژ دونیایێ بارکر وبەر بدلوڤانیا خودێ ڤە چوو و ئەگەرێ مرنا ویژی نەخوەشیا دلی بوویە و ل 2-11-1984 جەنازێ وی ببالەفرەک تایبەت بەربسوریا ڤە هاتە گوهاستن.

گەلەک نەخوەشی و گرفتاری جگەرخوینی دژیانا خوەدە دیتینە وبەلکو رەوشا وی یا تایبەت ژی دهەلبەستێن ویدە خوەیا دبە و هەر وەسا رەوشا بن دەستیا مللەتێ کورد جگەرخوین بیەک جار هەژاندیە، لەورا گەلەک نموونێن هەلبەستێن وی وەسا وی خوەیا دکن کو مرۆڤەک علمانی دژی دین و ئاین بوویە، براستی ژی جگەرخوین ژ ئالیێ زەلامێن ئاینی و دەولەمەندان ڤە توشی هەوەک دژوار بوویە کو جارنا دگوتن جگەرخوین کافرە گوهـ مەدنێ وجارنا دگوتن مارکسییە وگەلەک گونەهێن دی پێڤە دهێلان، لێ جگەرخوین وەلاتپاریز وبوێر و کوردەک رەسەن و دلسۆز پاک و پاقژ بوویە وهزر و بیر وشیانێن خوە ژ بۆ وێ یەکێ تەرخان کرینە دا کو مللەتێ وی هشیار وزانا ببە وئەو نەبوویە دژمنێ راستیا ئایینێ ئیسلامێ بەلکو دژمنێ وان رەفتاران بوویە ئەوێن بناڤێ ئیسلامێ دهاتنەکرن.

## جگەرخوین و هەلبەست

کەسێ بهێت وبەرهەمێ جگەرخوینی یێ شعری بخوینت -مەبەستا من کەسێ تایبەتمەند- دێ گەهتە وێ ئەنجامێ کو ژلایێ هونەری ڤە جگەرخوین کەتیە دبن کارتێرکرنا جزیری و خانی ڤە درووبێ رۆخساریێ" شکلی"ڤە ئانکو وی هەلبەست برۆخسارەک کلاسیک نڤیسییە لێ دبیاڤی هزرو وبیران دە جگەرخوین هەڤچەرخ بوویە و دهێتە ژمارتن یەک ژ گرنگترین هەلبەستڤانێن کوردێن نووژەن ژ بەرکو وی پەیڤێن نوو، هزرێن نوو، بیرو باوەرێن نوو بپیڤەرێن وی سەردەمێ ئەو تێدا ژیای دهەلبەستا خوەدا بکارئانین..

لێ دیسا جگەرخوین دمینە جزیری دئەڤینداریا خوەدە، وخانی د نەتەوەیی یا خـوەدا، وفـەقـییێ تەیران دنازکی یا خـوەدا و ئەڤ چەندە خـوەیا دبە دەمـا جگەرخوین ناڤێ جزیری و خانی بدەهان جاران دهەلبەستێن خوەدە بکار دئینە مینا.

خــــــەرابـاتم ژ مــــــەی خــــــانـێ
مــــە مـــــەی دا ئەحـــــمــــەدێ خـــانـێ
جــــــزیری فــــــرکــــــە فـنجــــانـێ
ژ کـــــــوپ و گـــــــوزکـــــــێـن باتـی

## جگەرخوین و رۆمان

وەک هەولدان جگەرخـوینی بزاڤـێن نڤـیـسـینا رۆمـانی هەبووینە لێ وەها خوەیایە کو ئەو دوارێ رۆمـانێ دە نەهند سەرکەتی بوویە ژ بەرکو شیـانێن وی شیانێن هەلبەستێ بوون و تەنێ وی دوو (2) رۆمان نڤیسینە ئەوژی "رەشویێ دارێ "و "جیم و گولپەری".

## جگەرخوین و دیرۆک

جگەرخـوینی گـەلەک خـوە بدیرۆکـا مللەتێ کـورد ڤـە مـاندی کـریە و هەولدانەک باش کریە دوارێ نڤیسینا دیروکێدە و ئەوی پرتووکەک مەزن ژ دوو بەرگا پێکهاتی لدوور دیرۆکا کوردستانێ نڤیسییە و ناڤی وێ کریە "تـاریخا کوردستان".

## جگەرخوین و مارکسیسزم:

مینا هەمی روشنبیرێن رۆژهەلاتا ناڤین ژ چەرخێ بیستێ سالێن چل و پێنجیان جگەرخوینی رێکا مارکسیەتێ ژ بۆ رزگارکرنا کوردستانێ وەک رێباز

باوەر پێ ئینا بوو، لێ دسەر هندێرا جگەرخوین مرۆڤەک نەتەوەخواز بوو و دخواست مارکسیەتێ بۆ دۆزا نەتەوی بکار بینت ئانکو مفای ژێ وەرگرت و ئەوی گەلەک هەلبەست بمارکسیەتێ و ریبازا مارکسی نڤیسینە لێ چ جاران جگەرخوین نەبوویە مارکسی ژ بۆ مارکسیەتێ بەلکو ئەو سەرکەتنێن وی سەردەمی مارکسیەتێ ل کوبا و ڤیتنام و کمبودیا و گواتیمالا بدەستڤە ئینای بووینە ئەگەر گەلەک روشنبیرێن کورد هەلبەت روشنبیرین روژهلاتا ڤێ ریبازا بۆ رزگارکرنێ هەلبژێرین....بکورتی جگەرخوین هەول دایە مفای ژ گەلەک بیر و باوەران وەرگرە بۆ ئاڤاکرنا ئایدۆلۆژیەک نەتەوی.

لێ پشتی پەیدابوونا شورەشا ئیلونێ ل باشورێ کوردستانێ و بدەسڤە ئانینا ریکەفتنا 11ئادارا 1970جگەرخوین وەک مرۆڤەک نەتەوی و دوور ژ مارکسیەتێ خوەیا دکەت ئەڤ چەندە ژی دیارە ددیواناوی "کیمەئەز"دا یا کو ل سالا 1973ل بەیروتێ هاتی چاپکرن.

## جگەرخوین و دۆزا کوردی:

مینا جگەرخوینی- چ هەلبەستڤانێن کورد هەلبەست بکورد و کوردستانێ نە گوتینە، بەلکو جگەرخوین بوویە دەنگێ شورەشێن کوردی و گەلەک قوربانی ژی دڤێ ریدا داینە.

وجگەرخوینی کوردستان ژی دیتیە ئێک پارچە زولم لێ هاتیە کرن و لسەر چوار دەولەتان پارڤە بووی، بەلێ چ جاران جگەرخوینی هەلبەست بپارچەکێ نە نڤیسییە ویادی پاش گوه ڤە هاڤێتیە، ئەوی د "7" دیوانێن خودا بهزاران خەون بکوردستانێ و ئازادیا وێڤە دیتینە، جاران کوردستان کریە دایک، جاران کریە یار، جاران کریە بەهەشت، لێ ئەو گەلەک لسەر وەلاتێ خو کوردستانێ گریە وژێرا روندک باراندینە.

## جگەرخوین و زانست:

هەلبەستڤانێ مە جگەرخوین مروڤەک روشنبیر و مەژی ڤەکری بوو لەورا وی هەر کور و کچێن کورد هاندایینە بۆ خواندن و زانینی ژ بەرکو وی زانین و

زانست بباشترین رێ هەلبژارتیە داکو کوردستان رزگاربیت.

ئیـــــــرۆ رۆژا خــــــوەنـدەڤـــــــانـا
خــــــورتـێن هـێــــــژا خــــــورتـێن زانـا
رۆژا شــــــێـــــــران رۆژا مــــــێـــــــران
رۆژا کـــــــــــــــوردێـــن پــەهــلــەوان

## جگەرخوین و جڤاکێ کوردێ:

دگـەلەک نموونێـن هەلبـەسـتـاخـودا جگەرخـوین دەردەسـەریا کـوردسـتـانێ ڤەدگێریت بۆ وان رەوش و تیتالێن کەڤن ییێن کو بووینە ئەگەرێن سەرەکی ژ بو ژێکڤەبونا کوردستانێ ومللەتێ کورد، دیسان جگەرخوینی هێرش بریە سەر وان شێخ و ئاغ ودەرەبەگێن نەکەفتین دخزمەتا دۆزا مللەتێ خودا و ئەو کەسێن ئایین بو بەرژەوەندیا خـو یا کـەسی بکارئینایین رسـوا کـرینە وری رەش دەرخستینە مینا هنەک شیخ و دەرویش و سوفیێن کو گەلەک جاران بووینە ئەگەر مللەت دخەوەک مەزن دا بمینت.

گـــــــورمــــــــینـە دەرویـش هـار و دیـن
هـاوار دکـی قـــــــــێـــــــــریـن و شـین
ســــاڤــــار و نیــــڤــــشـک ژێرە بین
بـرچـیـنـە زارو تـەڤ ل مــــــــــــــال

عــــەربـانێ باڤــــێــــژ وەر بـخــــوین
ژهـرە وەخــــــســــــــتــــــە ئـۆل و دیـن
هـەتـا جـگـەر لـن بـوویـە خــــــــویـن
وەلات بـخـــــــــوازن ئـەم هـەڤــــــال

## بەرهەمێ جگەرخوینی یێ چاپکری

1- دیوانا ئاگر و پیتی / هەلبەست 1945 شام
2- دیوانا سەورا ئازادی / هەلبەست 1954 شام
3- دیوانا کیمە ئەز / هەلبەست 1973 بیروت
4- دیوانا روناک / هەلبەست 1980 ستوکهولم
5- دیوانا شەفەق / هەلبەست 1982 ستوکهولم
6- دیوانا هیڤی / هەلبەست 1983 ستوکهولم
7- دیوانا زەند ئاڤیستا / هەلبەست 1983 ستوکهولم
8- تاریخا کوردستان / دیروک 2 بەرگ - ستوکهولم
9- فەرهەنگا جگەرخوین / قاموس 1961 بغداد
10- رەشوییێ دارێ / رومان/ شام
11- جیم وگولپەری / رومان /شام
12- سالار و میدیا / داستانا شعری /بیروت 1973

## ژێدەرین من مفا ژێ وەرگرتی

1 -دیوانا ئاگر و پیتی 1945 چاپا شام.
2- گوڤارا ماف 1996 چریا ئێک - دهوک - هەڤال زاخویی.
3- حەفتیناما خەبات 22 چریا ئێک - 1997 هەولێر- هەڤال زاخویی.
4- پێشەکیا دیوانا روناک 1993 استانبول -کمال بورقای.
5- دیوانا ئاگر و پیتی 1992 چاپا استنبول.
6- دیوانا روناک 1993 چاپا استنبول.

## بکورتی ژینا من

سـالا هزار و نەهـ سـەد وسێ ئەز هاتم دنیـایێ
بناڤێ سولتان شێخ موس ئەز چێبوومە ژدایێ

هەتا بووم سێزدە سالی ل گوندێ مەی هەساریێ
ژینا خـوە من دبۆراند پاشێ ژوێ مـەدا رێ

باڤێ منێ ری سپی خوەدی مرۆڤ و روومەت
نەمرۆڤەک مال گەنی بێ ناموس وبێ غیرەت

ژ تەنگاسی، نەچاری، مە ئەو گوندێ خوە بەردا
هاتن ئاموودا رەنگین، باڤێ من زوو ئەمر دا

دیا منا بەلنگاز پینجی سـالی دلوڤـان
سالەک پشتی باڤێ من، ئەوژی ل وی بوو مێڤان

برایێ منێ نیڤ مـــەلا، ژ عـــالـەمـــا رۆحـــانـی
راست و درست چ بێــژی ئەو تشـــتــەکی نزانـی

وی پیـــرەکـــا خـــوە ئانی بێ وژدان و بێ مـــەژی
بگوتنێن خوە ئێن چۆرس، ئەو من بێ دەرب د کوژی

خوەشکا منا خوەندەوار، بێ ئینساف و بێ وژدان
ئەز رەڤـییـام هاتم جەم وێ ژی ئەز کـرمە شـڤـان

گەهـ ل ڤـر و گەهـ ل وێ من عـەزابەک مەزن خوار
یا (الله) ویا خـــوەدێ پاشێ بوومــە خـــوەندەوار

ژینا من یا کـــەڤـنارە ئێـــدی هاتە گـــوهارتن
تەڤ خوەشی و زانەبوون حەفت هەشت سال هن بـ هن

من دەست بکوردیێ کـر پەیدا کـرم چەند مـرید
بـ خوەشخان و رەشبەلەک خەسما پشتی شێخ سەعید

پاشێ چوومـە عـــیـــراقێ ژ وێ ئەز چوومـە ئیـران
هەچی کــــەسێ بدیـما ژ من دمــــانە حــــەیران

من ئیـجـــازا خـوە ســتـــاند بســەربەســتی مـێـرانی
ژ نوو کـــەچا خـــالێ خـــوە ژ هەســـارا خـــوە ئانی

بووم مـەلایێ هاسدا ژۆر جـبـەپوش و ســەربشـاش
ژ نوو رێیا راست و خوەش بوو سەر ژۆر و رێل وکاش

من بدووڤێ دنێ گرت، ڤینا وێ کەت دلێ من
بارێ گوندو و ئێ کولفەت، هەمی کەت سەرملێ من

پاشێ هاتە بیرا من کو ئەز ببم خوەدی گوند
دلێ من ژی گۆتە من گەلەک باش و گەلەک ڕند

من ژ ئاخا جزیرێ دو گوند گرتن کول و خەم
ناڤێ یەکی چێلەک بوو، ئێدی مەکر جەهەنەم

دناڤ مەدە نەما بوون نە ئاغا و نە کێخوە
عەلو و چەلو کوم بقول، من تەڤ کرن وەکی خوە

رۆژا مە گوند ئاڤاکر کەتە راستێ موختاری
گوندێن مە بوون بەربەری، دژمناهی، نەیاری

تەڤان گرتن دارێن خوە بوونە وەکە گورێن هار
ژوی بەختێ منێ رەش، کورێ پۆتێ بوو موختار

سەرمیانێ وی دەرەو ل سەر وی بوو بەربەری
وەک دووچەیی تالیانی پاشێ وی ژی بخوە دەری

خوەدی مال و خوەدی گوند ل بەرگیلێ بوو سوار
رێ ژێ خستە مالا خوە ترۆ پاشێ بوو عەتار

پشتێ علمێ خوە ئێ پڕ بووم دۆدۆیی قولنگڤان
بووم هەڤالێ کوم بقول کورێ پۆتێ سەرمیان

ئەڤ جیهانا خاپینووک هەتا مەژێ خوە ناس کر
چ بکم فێدە نەمایە عەمرێ خوە من خلاس کر

چما راستی دبێژم ل ناڤ دینا بوومە دین
هەتا بمرم ژ نووڤە خەلک ئێ بێژن جگەرخوین

## بێریا وەلات

کـافەریدوون، کـا درەفش، تاجـا کـەیان ل کـوویە
کا گوهدەرز و کا روستەم، کا ئەو مەیدان ل کوویە؟

کـا پادیـشـاهێ ئەلوەند، کـا سـولتـانێ ل دەینوور
کا ئەیووبی، کا دێسەم، کانی مەروان ل کوویە؟

کـا مـیـرەکـێن ل بابان، کـا پاشـایێ رەواندز
کـا جـزیر و کـانی مـیـر، کـا بەدرخـان ل کـوویە؟

کـانی مـیـرێ بەهدینان، کـانی مـیـرێ هەکـاران
کـا مـیـرەکـێن ل زازان، مـیـرێ خـەرزا ل کـوویە؟

کانی میرێ حەسەن کێف، کانی میرێ ل ساسوون
کا میرەکێن مەجەن کورد، میرێ شێروان ل کوویە؟

کا مەلاتیە، کا خەرپووت، کا چەرمووک و سوارەک
کانی ئورفە، کا سرووچ، میرێ ملان ل کوویە؟

کا ویرانشەهـ، کا دیرک، کا مێردین و نسێبین
کانی ئامەد، کا هەزرۆ، میرێ هیزان ل کوویە؟

کانێ ستەور وکا مدیات، کا ئەرزەن وبشێری
کا ئاشیت وکا هێتەم، کا گوردلان ل کوویە؟

کا بەدلیس وکا سێرت، کانی مووش و ئەرزەرۆم
کانی قارس وبایەزید، کا مەرێوان ل کوویە؟

کانی مکس وکا خەسخێر، کانێ سەرا مەخینان
کانی دەشتا جۆلەمێرگ، کانی وەستان ل کوویە

کا شەنگال و کا مووسل، کانی زاخو، کا دهوک
کانی ئاکرە، ئامێدی، کانی بارزان ل کوویە؟

کا هەڤلێر و کانی کۆی، کا حەریر و رەواندز
کا شەقلاوە، کا دەرتەنگ، میرێ سۆران ل کوویە؟

کا کەرکووک وشەهرەزۆر، کا حەلوان وکا دەینوور
کا کەلۆس وکا نەشکاس، کا مەهرەوان ل کوویە؟

کا تەنوورە، کا زەلەم، کا مەشیلە، کانی لۆی
کا سرووچک، کا ئالان، کا دومەهران ل کوویە؟

کا لۆران وکا گۆران، کا حەمرین وکا سەفین
کا ئەو باژارو ئەو گوند، کا کوردستان ل کوویە ؟

کا ئەو دەشت وکا چیا، کا ئەو ئاڤ وکا گیا
کا ئەو کوون وکا کۆچەر، کا ئەو زۆزان ل کوویە ؟

کا ئەو دەنگێ پەزێ قەر، کا ئەو گولێن سۆر و زەر
کا بنەفش وکا ریحان، کا گولستان ل کوویە ؟

کا کووڤی و کا ئەڤۆر، کا ئەو دەنگ وقۆرەقۆر
کا شرینا کەوێ نێر، کا نێچیرڤان ل کوویە ؟

کا ئەو جۆت و ئەو جۆتار، کا ئەو پەز و کا دەوار
کانی بەرخ و کانی کار، کا بێریڤان ل کوویە ؟

کا ئەو مێرگ وکانی دەشت، کا ئەو باغ وکا بهەشت
کانی سەیران، کانی گەشت، کا ئەو دیلان ل کوویە ؟

کا ئەو خۆرت و کا کورک، کا ئەو شال وکا شەپک
کا گوڤەند و کا کەچک، کا زرناڤان ل کوویە ؟

کا دلشاد وگولیزار، کا شیرین وکانی زین
کانێ عەیشێ، کا فاتێ، کا پەریشان ل کوویە ؟

کا ئەو مێر و کا ئەو ژن، کا ئەو کالێ رھ مەزن
کا لێلێ وکا لۆلۆ، کا ئەو حەیران ل کوویە ؟

کا ئەو کەن و کا گەشی، کا شادی وکا خوەشی
کا سەرسال وکا نوورۆز، کا مهرەجان ل کوویە؟

کا ئەو ئاڤا سار و خوەش، کا گندۆر و کا زەبەش
کا برنج وکا گەنم، کا ئەو بوستان ل کوویە؟

کا هرمی وکا ئینجاس، کا بیهۆک وکا تری
کا ئەو خۆخ وکا هنار، کا دوەبەلان ل کوویە؟

کا ئەو زیڤ و کا ئەو زێر، کا کانییێن گاز و قیر
کا ئەو تەرش و کا تالان، کا ئەو دەوران ل کوویە؟

کا وەلاتێ مە رەنگین، ئیرۆ ژار و بریندار
جگەرخوینۆ دەبگری، کانی دەرمان ل کوویە؟

## شاهناما شەهیدان

دخـــوازم ئەی دلۆ ژارۆ بـچـــاکی
هەری مـیـرێن وەلاتێ مە تو راکی

ببێژە ئەی شەهیدێن دین ومللەت
بەسە رابن، سەرێ رۆژا مە دەرکەت

بەگ و ئاغـــا ژوە ئـیـــرۆ دگـــازن
بەســە رابن وەکی مـێـران مـەرازن

دلۆ ژارۆ ژ خـــالد بەگ رە بێـــژە
بسـەربەسـتی تو یەک نـوتقێ برێژە

ببـــێـــژە خـــالدۆ رابە دەرەنگە
هەمی کـوردان بهـەڤـرە دایە دەنگە

ژ وێ رابە هەرە بێـژە فـوئاد بەگ
ژ کورمـانجـارە رێزانی تو بێ شەک

قـەلەم فـێـدە دکی ئیـرۆ تـو رابە
خـەوا شـێـرین ژ بـۆمـە پر عـەزابە

د ڤی وەختی کەسێ وەک تە نەزایە
بەلێ چبکم ژ من ئیـرۆ جـودایە

دلۆ بێـژە کـەمـال فـەوزی تو کـانی
تو دلخوەش بە ، بڤان رۆژێن جوانی

دزانم کـو دڤی وەخـتـی تو رابی
وەلاتێ مـە ژ خـوینـرێژان جـوداکی

دلۆ ئوسف زیا راکــە ژ گــۆرێ
بەرێ کوشتی بجارەک بدنە دۆرێ

ژ بۆ کـوردان بکن جـەهدو خـەباتە
هەلا رابن ســوبە عــیــدا وەلاتە

رزا رابە جـیـهـان بوویە سـەرفـراز
ددنیـا مـانە تەنهـا ئەم بەلەنگاز

بنێرِن هوون جهێ تەختێ شەرەفخان
خەراب بوویە ژ دەستێ لاوێ تووران

ئەیا ســالح بەگێ هنێ هەلســتــە
وەلاتێ مە لســەر تە ژارو مەســتە

بدەستێ خوە تو بگرە شووریێ کوردان
بدەڤ بێـژە ژ بۆمە وەعـزێ قـورئان

دلۆ رابە ببــێــژە حــاجی ئەخــتی
برا رابە خـوەدانێ تەخت و بەخـتی

کورێن تە تەڤ دکن قێرین وهاوار
ژ کـوردارە هەمی بوونە فـیـداکـار

ل جی رابە، ژ جی رابە حەقی بەگ
ل شوون بازان دخوینن حاجی لەگ لەگ

وەلاتێ وە خـەلا راکـر ل شـێـران
نهـا سـەیدە ژ بۆ کـوندێ شکێـران

وەرە خـــەیری بەگی رابە ژ دێرسم
ژ تە حــالێ وەلاتێ خــوە بپــرسم

هەری ئەو مــادەن وباغ و رەزانا
گـەلۆ راسـتـە کـەتن دەسـتێ نەزانا

بەسـە راسم تو رابە ئەی ئەفـەندی
بخــوینە تو زمــان وزارێ زەندی

بنێرە خوەش لڤێ جەهدو خەباتێ
ژ رۆژئاڤـــا هەتانی رۆژهـلاتێ

ژ هیـزانێ تو رابە سـەرخوە برهان
تـو برهانی ژ بـۆ داوامــە کـــوردان

بناڤێ تەدکن جـــەهدو خـــەباتە
نەتیـــجـــامـــە بەلێ تۆلا وەلاتە

وەرە رابە مــوعـــەلم تـو ژ پیـــران
نەپیـــــرانە، بەلێ پیـــرە ژدەردان

گەلەک ژارە ژبەر دەردێ کورێن خوە
خەراب کر خانومانێن هوندرێن خوە

تەیب عالی وەرن جارەک شیار بن
قـەلەم بگرن ل شینبـۆزان سـواربن

بەلێ زانم کـو ئەم پێکڤـە بێن یەک
ئەم گۆگێ بەری خەلکێ بێن شەک

وەرە رابە سلێـمـان لاوێ ئەحـمـەد
وەلاتێ تە هەمی زۆزان وسـەحـەد

بەسـە رابە ژ بۆ تە هاتی فـەرزەند
بەلێ فەرزەندەکی روستم هنەرمەند

وەرە رابە عەفیف بەگ وەک عەگیدا
ل مـەیدانێ بدن خـار وجـریدا

عـەشـیـرا حـەیدەران وهەم جـەلالی
ژ مـەیدانا کـەمـالێ مـانە خـالی

ببـێـژە ئووسـفـۆ رابە دەرەنگە
ل هەر ئالی بنێـرە قـال وجـەنگە

وەلاتێ تە هەمی مـێرگ وبەهەشـتـە
دەلالێ من تو رابە چاخێ گـەشـتـە

دلۆ خـالـد بـەگی ئووسف ببـێنە
ژ خەو راکە کەرەم بەگ پێرە بێنە

ببێژە ئەی هنەرمـەند و سەر فـەراز
تو رابە بۆتە هزر بوویە داخـواز

وەرە ئەی شێخ سەعـیدێ پر منەوەر
بەسـە ، رابـە تو ئـیـرۆ ئەی دلاوەر

زەمـانـێ تە نە ئـەو چاخـە تورازی
بسـەربەستی تو حـەقێ مە بخوازی

بەلێ وەختێ تڤنگ و تۆپ وشوورە
عـەزیزێ من نەجـاتا مـە نە دوورە

تو عەڤدلقادری شێخێ ل نەهری
دعالەم دە تو مەنشوور و بفەخری

کەرەمکە رابە سەرخوە ئەی تو سەروەر
ژ بۆ کوردا تو رێزان وتو رێبەر

تو شەمسەدینی رۆژا دین و مللەت
ژ قامشلۆ تو رابە پڕ بهمەت

بەلێ زانم کو قەهرا تە چ دۆژە
وەرە جەرگێ نەیاران پێ بسۆژە

وەرە شێخ عەڤدلاهێ مەلەکانی
شەهیدی تو، دناڤا مەلەکانی

ل زۆزانان تو بنێرە ل خوینێ
ل جانێ مە تو نابێنی برینی

وەرە شێخێ مە ئەیووبێ ب سەماغ
بنێرە تو ل زۆزانێ قەرەژداغ

هەمی گوند و هەمی کانی، هەمی وار
خەراب بوونە ژ دەستێ زولم ونەیار

وەرن رابن گەلی شێخێن دچانێ
بنێرن هوون لڤێ ئاخر زەمانێ

فەلەک بێ بەختە لەورە خووز و خوارە
هەتا ئیــــرو بکوردان رە نەیارە

وەرە شـێـخ عـەڤـدلاهێ نارکی زوو
بنێـرە تـو ل مـە یەک جـارەکێ زوو

وەلاتێ مـــە وەکی ئاشێ نەیارا
سـەرێ کـوردا دهێـرت هەر ببـارا

وەرە ئەی شێخ شەریفێ ساحبێ دین
ژ کـــوردارە بەلێ زانم تو دووربین

تو باوەر بە هوونێ رۆکێ ببـــین
ئەمێ حەیفا وە دێ جارەک هلین

دلۆ ژارۆ هەرە نک عـەڤـدرەحـمـان
ئەوە شێخ و شـەهیدێ دین وئیـمان

تو گەهـ بگری، تو گەهـ پێـرە بنالە
بەلێ شێـخێ تە پر قـەنج و دەلالە

هەزار هێـسـتـر ببـەک چاڤی برێژە
ئەدەب بگرە ل بەر وی ژێرە بێـــژە

جگەرخوین بۆتە هەردەم پەسەندارە
هەزار رەحـمـەت ل گورنا تە ببارە

ژ تەپێ رابە سەرخوە ئەی تو سەیدا
رِحێ شێرین ژ بۆ کوردان تە کەی دا

چلۆ سەبرا تە تێ ئیرۆ دگۆرێ
برایێن تەکەتن بن دەستێ زۆرێ

وەرە باتوییان عەمەر ئاغا دەلالو
ل حالێ مە بنێرە ئەی تو خالو

ژ بۆ وە پر فهێت وئار و شەرمە
کورێن جەنگێز بجارەک تێنە سەرمە

وەرە رابە فەتاحێ حاجی دەلی
وەلاتێ تە هەمی زۆزان وگەلی

بنێرە تو ل وەلاتێ ژێر و ژۆرین
هەمی کوردن کورێن بەهرامێ چۆپین

تەمەر ئاغا ژ هیزۆلێ تو رابە
بنێرە تو ل بەختێ مە خەرابە

بەلێ ئیرۆ هنەک یارە ژ بۆ مە
بەلێ چبکم کو ئێڤارە ژ بۆ مە

وەرە ئووسف بەگێ زازی بگۆری
بدێرە گوه هەوارەک تێ ژ سووری

هەچی کوردن وەکی روستەم کوڕێ زال
وەلێ چبکم، نەهن حال ونەهن مال

وەرە رابە تو سەیفەلاهێ هینی
تو دێ حالێ وەلاتێ خوە ببینی

وەلاتێ تە کەتە دەستێ نەیارا
هەچی کوردن ل سەر شاخ ودیارا

دلێ ژارۆ بە یادۆ رە خەبەر دە
بلا رابە مەجالا قەومێ کوردە

وەرە جارەک ل کوردا ئەم بنێرن
هەمی خۆرت وپلنگ وشێر ومێرن

ورە رابە ژ ناڤ بۆتان تو گورگین
تو دلخوەش بە ژ بۆ تە هاتە مزگین

برایێن تەشیار بوونە بجارەک
د ناڤ واندە نەمایە قەت نەیارەک

ئەرێ سەبری، کوڕێ فارۆ تو کانی
گەلۆ دیسا ل سەر شاخ وچیانی

بەلێ زانم دگۆرێدە دنالی
تەک وتەنها و ژارو بێ هەڤالی

ژ ئەرخەن رابە شەوقی، پر بشەوقی
ژ کـــوردارە تو دلخـــوەش و بزەوقی

بنێـــرە تو لـوەلاتێ مـــە دیارن
هەمی کـوردن لسـەر وانا فـرارن

ژ ناڤ قەوما تو رابە ئەی محەمەد
هەمی کوردن، ژ نک تە، تا بسەرحەد

وەکی تە ئەو هەمی شێرو پلنگن
بیەک جاری بقیل وقال وجەنگن

حـەســۆ تێلی براهیم بەگ تـو رابە
ل زۆزانێ ئـەراراتـێ خــــــوەیابـە

بژی دیســـا ، بژی دیســـا براهیم
ژ کـــوردارە تـوی دیســـا براهیم

دلۆ بێژە عـەلی جـان وسـەید خـان
شەهیدن هوون، بەلێ خوینا مەکوردان

بەلـێ زانم جـــــهـێ وە پر بلـندە
برا رابن خـــەوا شــێــرین نەرندە

ژ تەوفـیق و هەڤـالێن ویرە بێـژە
هەچی کوردە وەکی مە خوین د رێژە

بقوربانا وه بن سەد شاه و کەیخوه
دگەل مال وعەیال و زارۆییێن خوه

دلۆ بەس بەس خەلاس نابن عبارات
هەزار رەحـمـەت ل زۆزانێ ئەرارات

هەنە تێدە شەهیدو شێخ وخازی
نە وەک شێخ و شەهیدانێ مەجازی

بەلێ سۆندێ دخوم جارەک بـ لالەش
بزەردەشت و برۆژ و هەیڤ و ئاتەش

بئەهریمان، بهورمزگاه ویەزدان
شیار بوونە بەلەنگازێن دکوردان

تڤنگ چوویە نها دۆر هاتە خامە
خەوا شێرین لچاڤێ مە حەرامە

بنێـــــــرن هوون ل زۆزان ودیارا
هەمی سۆرن، ژ بەرخوینا ئەزارا

کەچ و دوخت وجوان وقیزو بووکان
ژ دەردێ مە کەتن رەنگێ پەپووکان

نە بەس کوشتی ئەڤن لێ ئەم دناسن
دگـــۆران دە، دلۆران دە چقـــاسن

ژوان دوورم، وەکی کـــــۆرم دتاری
هەزار رەحمەت ل گۆرنا وان بباری

بەلێ رۆژا کو کوشتی چوون وەفاتە
چ خـــوەش رۆژە، وەکی چەژنا وەلاتە

ژ وێ رۆژێ جگەرخوین و جگەرسۆز
بقــوربانا وە بم عــیـــدا وە پیــرۆز.

## قبلەگاهی شاعران*

سەروەرێ عالی جەناب کورد تەڤ بن فەرمانا تەبن
کــــورەش و دارا وجـــەم هەردەم دپێـــوانا تـەبن

لەشکەرێ کورد و عـەرەب هەردەم دبن دارێ تەبن
سێ سـەد رزاخـان وکـەمـال تم بقـوربانا تـەبن

عومرێ کەی کاوس بکی وەک عـومەری عادل بژی
(جـاهیـدو لا تقنطوا) تم رەمز و نیشـانا تـەبن

تالع وبەخـتێ سـپی تم رێبـەرو دوسـتێ تەبن
ئەسعد وسعد وسەعید هەردەم دفەرمانا تەبن

رایەتێن نەسرا مـوبین تم راسـەری هێـزێن تـەبن
ئـایەتێن فــەتح ونەســر هەردەم ژ بارزانا تەبن

سۆر ولۆر وگۆر وكورمانج لەشكەرێن هێزێن تەبن
سەد وەكى ئدريس ومەسعود تم درێزانا تەبن

گێژ وزارم ئەز نكارم زێدە پەسنێ خوەش بدم
فارس ورۆم وعەرەب سەركۆپێن ئەيوانا تەبن

پشتى كوردستان خەلاس كى قبلەگاهێ شاعران
سەد جگەرخوين وهەژار دەمسازێن ديوانا تەبن

ل هاڤينا سالا 1970 ل ناو پردان ئەڤ هەلبەستە هاتيە ڤەهاندن، كو وى دەمى سەيدا جگەرخوين مێڤان بوويە ل كونگرێ (8) ێ يێ پارتيا ديموكراتا كوردستانێ.

## کوردستان

بلـــنده بـــەژن وبـــالا تـــە
ل ســـەر تاجـــا تە ئەســـمـــانە
کـــتـــانەک رەنگ ســـپی دایە
ســـەرێ زۆزان و ســـیـــپـــانە
ل ژۆرێ کـــــانی و جـــــۆبار
وەکـــو هێـــســـتـــر دبارن خـــوەش
ل ژێـــرێ تـــە دبـــێـــنـــم ئـــەز
بهـــەشت و باغ و بســـتـــانە
کـــراســـەک ئەتلەسین کـــەسکە
ب رەنگێ رۆژێ نەخـــشـــینە

ل بەژناتە دبێنم خــــوەش

ب سورمە شال ومــیــتانە

چ رەنگ شــێــرینە یارا من

شەپال و نازک و شــۆخــە

فــەرات و دیجلە وخــابوور

ب ســــەر بەژنێ دەبەردانە

ژ خـوینا من تو لێڤ سـۆری

ژ بینا من گــولا جــۆری

تەنێ من بازنێ زەندێن

تە زنجـــیــــرێن د لنگانە

ئەڤــینا تە کـــرم شــەیدا

برینـدار و پەریشـــــانم

ژوان لێڤێن شێرین ماچەک

ژ دەردێ دل رە دەرمــــــانە

بـــرینــــدارم ب تـــۆیـــێـــن

ئاورێن چاڤــێن بەلەک ئیـــرۆ

وەرە دلبــەر کــو دەســتــێن تە

ژ ئێـــشــا منرە لوقـــمــانە

ب پیــــری ئەز دخـــــوازم کـــو
ببم زاڤـــــا تـو چ دبێــــــژی
نە خـــــەونە کــــو دبێــــژم ئەز
نەســـــاویر و نەگــــــۆمــــانە
تـو نـابێـنـی د گـــــوڤـــــەندا
مـــــەدا هەرکـــــەس دچی و تێ
ل هاویر شـــــاهی و جــــەژنە
ســــەمــــا و گـــــەر و دیلانە
قـــــەلەن خــــوینا منە چبکم
دڤێ کــــو ئەز بدم جــــارەک
مـــەگـــــەرجــــان و جگەر دەینم
دڤــــێ رێـــــدە چ ئـــــەرزانـــــە
چ زانن روومــــــەتا ڤێ شـــەنگ
و شـــــۆخێ بەگلەر و پاشــــا ؟
ب قـــــوربانا تە بن جــــــانا ،
هەزار مـــــیـــــر و بەگ و خـــانا
ئەزم کـــــــو تە ژ دەســــــتێ
دژمنان دەرخم ب مـــــێـــــرانی

ل سەر سینگا تە سەربەست بم
بپاریزم تە مەردانە
مەگەر دوور و رەشە ریچک
ل هاوير دژمنين خوين ریژ
مەکە باوەر بترسم ئەز
ژ سەهپا و ژ زیندانە
سەری من دانی یە ڤێ رێ
دڤێم بگهێمە ئارمانجێ
مەبێژە کو: گەلەک فەرسەند
ژ دەستین خوە بەردانە
دخوازم ترس و ساویر و
فەن و خاپان ژ خوە دوورخم
بزانە ئەڤ قەریژا کورد
نەیا چەند ماه و سالانە
هەچی چوویێ مەدە پەی وی
ژ من گازن مەکە نازک
مە ترسە هێ ژ بۆنا مە
دەمێن خورت و مەزن ما نە

هەزار سـالن مـەژی بوویە
قـەرێژ هێ نوو ژ خـەو رابوون
دخـوازن وی بشـوون جـارەک
مـە رێبـەر پیـرە - رێزانە
چەکـا مـن زۆر و زانـینە
ب بیـر و باوەر و داخـواز
ب تـووژ ئـاور دنـێـرم ئـەز
ل کـەڤنە شـار و ئەیوانە
سـویسـرا رۆژهلاتی خـوەش
ب شـیـرانی و نـازداری
ژ جـۆبارێن تە ئەڤ هندام
بجـارەک تێنە ئاڤـدانە
مـە بێـژە: پاشـدە مـاین کـورد
کـورێن کـەسـرا سـەری هلدان
ل سـەر شـاخ و چیـان لاوان
دەرەفـشـا کـاوە هلدانە

## کا وەلات و ئال ئۆل

ئەی فەلەک کانی ل کوو مان ئەو وەلات و ئال و ئۆل
چاڤ بەلەک کانی ل کوو مان بوونە خانم تۆگ و تۆل

کانی ئەو خۆرتێن دبەنگی کانی ئەو کالێن بدەنگ
کەتمە بن خەشما فرەنگی پر دنالن پۆلە پۆل

کانی سور گول، کانی بلبل، تەڤدە مانە مەست و دل
دەشت و زۆزان مانە بێ ئاڤ، تەڤ چیا و چا و چۆل

کانی باغ و کانی بیستان، کانی دار و کانی بەر
کانی ئەو رەز کانی ئەو پەز کا دەوار و جۆت وجۆل

کانی شێر و کانی ئەژدەر، کا پلنگ و کا عەگید
کانی رۆژا جەژن و شادی، کا ل کوونە هێل و هۆل

کـۆچ و کـۆچەر تەڤ نەمـانە، بـرج و ئەیوان هلوەشین
ئاخ ل زۆزانێ مـەرەنگین، کـا ل کـوونە کـۆن و کـۆل

کا فـەرات و کـانی خابوور، کـانی دیجلە کـانی زاب
کانی گۆلا وان و نازووک، کانی ئەو قاس گێر و گۆل

کـانی گـۆر و کـانی لۆر، کـانی بەخت و کـانی زاز
کـا شکاک و کـانی ئاشیت، کـانی مل و زل و زۆل

کانی کەرمان کانی کەرکووک، کانی وان و ئەرزەرۆم
کا کەلیس و کا مەلاتیا، تەڤدە بوونە خاک و خۆل

وان نەیاران کـرنە وێران، تەڤـدە کـوشتن خـان وبەگ
دێ ژوان بگرم بدەســتێ خــوە کــو نەمــرن دۆز و تۆل

ئەی جگەر خوین بەس ببێژە فورت و پەسنان هلدەخوە
پڕ دڤێ رێدە چڕاندن ڤـان عـەگـیـدان سـال و سـۆل

## فەراتێ دەردان

دەردین من کوورن وەک ضەمێ فەرات
فەراتێ دەردان هەلات و داهات
دەردێ پر مەزن، کولا  پر گران
دەردێ کوردستان، ئاخینا وەلات

ئەز تم دنالم هەر سال وهەر ماه
قیرین وفریاد، هاوار و سەد ئاه
دگەل من دگرین سەیران وشیرین
نالینە دەنگێ گولناز و دلشاه

شیرینێ مەگرێ پر پر دەلالێ
سەیرانێ مەگرێ خوە پر مەنالێ

گولنازێ مەگرێ، دلشاهێ مەگرێ
دژمن ل هەمبەر ڤێ کەڤنە کالێ

هایێ دێ ئەم روونن بێ دەنگ وهاوار
رەشاخوە ڤەکن دەسمال و رەشضار
دا دوست وهەڤال تەڤ نەبن خەمگین
ل مەشا نەبن دژمن ونەیار

هایێ دێ ئەم روونن سەر ضەمێ ئامەد
ئەم ژێ بپرسن کەیانیا مەد
کانێ ئەو برج وسەرا و باژار؟
کانێ کوردستان، زوزان وسەرحەد؟

کانێ وەلاتێ مە خۆش و رەنگین؟
کانێ ئەو شێرو گەرناس وبەنگین؟
دیسا تەڤ بگرین دلشاه وشێرین
کوور کوور بنالن رەنگێ جگەرخوین

## شام شەکرە وەلات شێرینترە

وەلاتێ من تـوی بووکـا جـیـهـانی
هەمی باغ وبهەشت و مێرگ وکانی

شـەپال و شەنگ و شۆخ وناز وگـەوری
گـەلەک شـێـرین ورِند و پر جـوانی

سـەری تاجـا سـەلاحـەدینێ کـوردی
ئەنی رۆژە د برجـا ئاسـمـانی

دو برهێن تە کەڤانێ روستەمێ زال
دو زولفێـن تە ژ تیرێن قـەهرمـانی

روویێ تە ئاگرێ زەردەشت و مەزدەگ
ژ تە هێستر شەرابا کامیرانی

دو لێڤێن تە کتێبا حاجی قادر
زمانێ تە ژ بەندا شێخێ خانی

چەنا تە کۆهێ جوود و شاخ و هەبلەر
قرک ئەیوان و تاقا کەسرەوانی

دسینگا تە کتێبا زەند ئاڤێستا
مەمک فەرفوورە تێدە نەقشێ مانی

دو دەستێن تە تخووبێن ترک وئیران
هەرۆ جەنگە بتیرێن زەرڤەشانی

ژ سینگاتە بژێر دە گەلیێ لالەش
زیارەتگاهە بۆ مە هەر زەمانی

بنیشان وبنان وخوین رژاندن
مە دەست گرت و قەلەن دا و تو ئانی

سەر وپا زەند وبازن تەڤ بحنە
هەمی سۆرن ژ رەنگێ ئەرخەوانی

بته ئەم شا نەبوون ئەڤ بوو دو سەد سال
ژ مـــە دەنگێ تڤنگا چوویە بانی

برا و لاو وباڤ وئاپ وپســـمـــام
لسەر تە هەڤ دكوشتن پەهلەوانی

ژ لوران تا بزازان تەڤ بخـــەنجـــەر
وهاتن هەڤ ل مـــەیدانێ بەرانی

بتـــالان وبكوشتن، هەم بســـۆتن
مە كۆنێ شەر لسەر سینگاتەدانی

ئەمـــیـــر وبەگلەر و پاشـــا و ئاغـــا
كـــرن وێران ســـەرا و برج وخـــانی

ل ئالیكی تە دەنگ وجەنگ وهالان
ل ئالیكی سەدایێ خوەشێ سانی

هەمی بوونە مـــرید وشـــێخ وســـۆفی
بەهەشـتـیـنە چكن ناڤ ونیـشـانی

ل ئاخـور رادزن لێ شـێخ دچی ژۆر
بەری نیـــڤـــرۆ ژ بانی تێ گـــرانی

سەرو پا تەڤ دکی گولاڤ وعەنبەر
دبێ نوورە کـــەرو مـــا تو چ زانی؟!

بڤان خاپان دخوارن خوارنێن خوەش
وەکی شێخ ومەلاییێن ڤی زەمانی

دو دەردێن مە هەبوون دژوار وغەدار
خـەزانی یەک، ئەوێ دن هەر نەزانی
وەکە شێر و پلنگان ئەم دچوون هەڤ
پەنیـــر رۆڤی ژ مـــەیدانێ هەلانی

مـە ئەو رۆژێن جـوانی تەڤ بدەردان
بزیڤـــاری، بەلەنگازی، شـــڤـــانی

تەرەش دایە سەرێ خوە بەر لسـەرمە
لتـــە رۆکێ دبی پیـــرۆز کـــتـــانی

جگەرخـــوینە کـــورێ تە هەر دنالی
ژبـەر ژانا نـەزانـی وخـــــــەزانـی

## رێیا سەربەستی دژوارە

چیــایەک بلند، بدار و کــەلەم بلات و شکێــڕ
ل هاویر زنار، ل هاویر تەبا، بپلنگ بـ شــێــر

پیرهەڤۆک، دەڤلۆک، دێو و مرۆڤ خوەر، گۆمان و خەیال
هەمی دزوورن، هەمی دکوورن، تەڤ تی و نەتێر

شەڤ رەش بتاڤان، باران ولەیلان بهەور و برووسک
رێ دوور وبترس، تەڤ ئاڤ و جڤار، تاریبیە وەک مێر

ل ژۆرێ چییێ، شارێ سەربەستی، ئازادی، بهشت
کـۆرتا بن دەســتی، نەوالا دیلی، کـۆلەتی ل ژێر

کەروان، کەروانێ ژین و ئەڤینی، کەروانێ خەبات
دانە سەر ڤێ رێ، کارکەر و جۆتکار بداس و ببێر

ئەم ژی دترسن، ژ هەڤ دپرسن، هەمی ئەڤ کـەروان
دچن دل بترس، خۆرتە مێر لپێش، لپاش قەلسەمێر

ترسـۆنەک بەرژێر، پاشـدە درەڤن، کـۆرتالا دیلی
گەرناس سەربلند، جهێ خوە دگرن، ل ژۆرێ باژێر

ل ترسۆنەکان، ئەڤ لات وکەلەم، هەمی دبن پەش
(دەڤی) دبن دێو، هەمی پیرهەڤۆک، لدۆرا زنێر

گەرناس نابێن، نە رەش و نە پەش، نە ساویر، نەترس
ترسـۆنەک رەڤـۆک، دەڤێ وان توجار ناچی بن گـوهێـر

خـۆرتە مـێر دڤـێن، تم سـەربلندی، تم پایەداری
قـەلسـە مـێر دڤـێن، ببن تێـر پەرە، بمێنن زک تێـر

خۆردێ خۆرتە مـێر، لێدان وزبندان، تم دار وقـەمچی
خۆردێ قـەلسـەمێر، کەچ و مەی و جام، برنج و پەنێر

سەرپێل بێ شەرەف، بێ بەخت، گونەهکار، هەردەم قەلسەمێر
کـــارێ وایـە تم، ژ بەرخـــوە ناچن، تم دچن بدێر

(سەهپا) بێ دانین، فەرمان بێ خوەندن، هەی رەبەن بێ بەخت
بکێـر وە نایێـن، نەمـال، نـە زارۆک، نە گـوند و نەزێر

خۆرتێـن جوامێر، وەلاتـپـارێزێن بشـان و شـەرەف
گەلۆ هوون دڤێن، ببن خۆرتەمێر، یانە قـەلسـەمێر...!

لێ ئەم دخوازن، بێن سەربلند، چیە بن دەستی؟
گوە مەدن گوندان، گوە مەدن زێرا، تەڤ تۆز و قەلێر

دۆلاب و چەرخا دنێ، هەر و هەر، بپێشدە دچن
سوبا ئیرۆیە، ئیرۆ دبی دوە، دوە ژی دبی پێر

بمێرانی هەر بپێشدە بێ ترس، ئەڤە رێیا مە
دەستێ هەڤ بگرن، وەک خوشک و برا، چ ژن و چ مێر

ئەم بمالێ خوە، زانن چاوایە، چ قەنج، چ نەقەنج
خورچکا عەتێر، کی زانی چیە، ژ غەیری عەتێر..؟!

کو ئەم ژ دژمن، جارەک نەترسن، دژمن دترسی
ئەم پەنێر ئەو کێر، لێ کو بێن مێر، ئەو پەنێر ئەم کێر

ئەگەر ئەم نەشکێن، بخوە ئەو دشکێ، دڤێ کو بشکێ
ئەم پسیک ئەو شێر، لێ کو بێن مێر ئەو پسیک ئەم شێر

## پیرا تۆرێ

هلکشیمە چوومە ژۆرێ هەر دو رەخ من بەند و رەز
من دی پیـــرەک تێ ژ تۆرێ کـــەر دبەردە تێ بلەز

هاتە نێزیک رۆژ بخێرەک دا و وەک من دل بخەم
پیرە بی بوو، پۆر سپی بوو، تاقی رەش بوو روو گەوەز

من ژ پیرێ خوەش دپرسی: ئەی مەتێ تو ژ کووڤە تێ
گو ژ سێرتێ دچمە بێرتێ، خوینیا رۆمێ مە ئەز

خان و ئەیوان کرنە وێران، مێر و ژن وسەر ژێکرن
من گو پیرێ قەی تو کوردی؟ چوویە تلیێن خوە بگەز

بەلکی بەندا رەز بگوهـ بن دەنگێ خوە پر هلمەکە
پر دترسم ئەز ژ دەربێ سنگوویێ رۆمـــا تەرەس

من دگـۆت ئاغـا وبەگ، وێ گـۆ کـورێ من گـوھ مـەدێ
ئەو شڤانن، سـەرمیـانن، دانە گـور وان جۆل وپەز

من کـورەک تـەنهـا هەیە، ئەو شـاندی بـاژار مـەدرەسێ
وی دوسێ پرس بۆمـە گـوتن پێ حـەلاندن جـەرگ وبەز

گـوتی: داییێ ئەم دخـوینن وەک جگـەرخـوین گـوتیـە
زوو بخـوینن، هەڤ ببـینـم بچنە کـوردسـتـان بلەز

## کوردستانم کا...!

باغ وبستانم کا    ئاخ گولستانم کا
دژمن تەڤ گرتن ئاخ    ئاخ کوردستانم کا

ئەم ئانین جیهان وێ    ئەم کرن ئینسان وێ
لێ مە زوو ئەو بەردا    ئاخ کوردستانم کا

گەشت وسەیرانم چوون    حەیران وخانم چوون
چاڤێم ل غوربەت ما    ئاخ کوردستانم کا

گوهـ نادمێ چوو د    شەڤ دچێ زوو تێ رۆ
تە ژبیرناکم نا ، نا    ئاخ کوردستانم کا

من جگەر تەڤ بوو خوین    بێ خوەندن وزانین
بێ تاج و بێ کەسرا    ئاخ کوردستانم کا..!

## دەزگرتیا خۆرتان

نالینەک تێ گـــوهێ من، لێ وندا و نهـــانە
ئاگـــر بەردا دلێ من، تەڤ بوو پێت ودخـــانە
بارەک دا ســـەر ملێ من، لێ بارەکی گـــرانە
دانە ســـەرهەڤ کـولێ من، هەمی دەرد وبەلانە

دەنگێ کـــێـــــیـــــە دنالی، نالە نالا وەلاتە
دکی گـــازی، دکـــالی، رابن چاخێ خـــەباتە
کـورد وزاز وجـەلالی، تەڤـدە چێکن جـڤـاتە
کـەس خـوە مـەدن ڤی ئالی، ئیـرۆ رۆژا فـەلاتە

خۆرتێن کوردان شیار بوون، گوهـ نادن ڤان نەمەردان
باڤ وکـالێ مـە رابوون هەمی مـرن ژ دەردان

دەردێن ل وان گران بوون، ئیرۆ ل مە چ سەردان
نەوەک باڤ وبرا بوون یارا خوە ژ دەست خوە بەردان

خەملاندیە سەرانسەر دەزگرتیا خۆرتامە
گەردەن سێڤەک سۆر و زەر، ل هێڤیا مەردامە
قەلەن خوینە نەگەوهەر، کوردستانا کوردامە
بێ تانک و تۆپ ولەشکەر، ئیرۆ وە ئەز بەردامە

کوردستانا دەلالم، هەر کەس تێ من دخوازی
ئەز پر شۆخ وشەپالم، من دەنگ دایە بنازی
ئەڤ بوون بیست و دو سالم، ل سەرمن جەنگە بازی
کوردو وەر من بخوازە، بەلێ بسەرفرازی

رابە سەر خوە بنێرە، هاویر مە تەڤ نەیارن
ل تۆپان گوه بدێرە، ل سەر مە بەر دبارن
دژمن ل ژۆر و ژێرە، ژ جەنگێ رە ل کارن
کوردێن سەرێ شکێران، نێچیر ژ بەرتە خوارن

ئیرۆ رۆژا خەباتێ، سەرخوەبوونە دۆزا وە
دەما ژین و فەلاتێ، ل کومایە سۆزا وە
هوون تەڤ شێرێن دلاتێ، رووڤی کەتە کۆزا وە
شکەستینە دماتێ، دژمن بریە بۆزا وە

شەڤ و رۆژا بخوینن، ببن سەربەست وزانا
تۆڤێ ژینێ بچینن، ژ بۆ دیل و نەزانا
جارەک هوون دێ ببێنن ڤان بەخچەو رەزانا
کوردستانێ دەرێنن ژ دەستێ ڤان دزانا

چاڤێن درەش مە کل دان، لسەر بانا راوەستان
تۆخ وئالا مەهلدان، باقێ گولان ل دەستان
سورمە، نیشان ل مل دان، پشت وکەمەر مە بەستان
مە سەد ئاور ل دل دان، خۆرتنو وەرن کوردستان

دۆستا وەمە تا ساخم، ژ بل وە کەس من ناڤێ
ئەز دلبرین وداخم، ژ بەر ڤێ شەوق وتاڤێ
ئەز رەنگێ شەڤ چراکم، شەوقا خوە دا گراڤێ
دل خۆرت و پر دەیاخم، د ناڤ وێ بەند وداڤێ

خۆرتو: ئەگەر تو رابی، وەک باشۆکە هەری چووک
نەخۆرت و شارەزا بی، تو نەستینی ژ من مووک
نەوەک شێر و گورا بی، بووکێ ددی بـ تووتووک
کو بێ تاج و سەرا بی، تێ چاوان من بکی بووک

بێ پادشاه و لەشکەر، کەنگێ ببی سەرفراز
کی بێ خەبات و تەڤگەر، دخی دەستێ خوە داخواز
بابا و بەختی ولۆر، بەراز وتۆری وزاز
نابن تەڤ یەک سەرانسەر، تەڤ دێ ببن بەلەنگاز

جگەرخوین خوەش دبێژە، لێ کورد نە تێ گهانە
تم گەوهەران درێژە، ل جەم وان بێ بهانە
ئەڤ پیسی و قەرێژی، نەیێن کوردێن نها نە
زنگار گهایە مێژی، لەو دین دکن بەها نە

## سەر خوە بوون

کوردنو، مەردنو پر خوەشە سەرخوەبوون
ئەو دەمێن تار وتەنگ کو مەدین ڤانە چوون
دەست بدن هەڤ هەمی پێشکەڤن ئەم هەمی
دا بچن بۆ وەلات یان مـــرن یان فـــەلات

رۆژ لە هاتە دەر، زوو شـــیـــار بن ژ خـــەو
ئەڤ دەما جەنگ و شەر پاشکەتن ئێدی هەو
دەست بدن هەڤ هەمی پێشکەڤن ئەم هەمی
دا بچن بۆ وەلات یان مـــرن یان فـــەلات

من دڤێن ئۆل و بەخت، من دڤێ پێشڤەچوون
من دڤێن تاج و تەخت، من دڤێ سەرخوە بوون
دەست بدن هەڤ هەمی پێشکەڤن ئەم هەمی
دا بچن بو وەلات یان مـــرن یان فـــەلات

## گوتنا وەلات

وەلاتێ من دگۆتە من: برازی
ل نەزمێ گوهـ بدێرە گەر دخوازی

جگەرخوینی، کورێ من تو ژدەردان
سلاڤان زوو ژ من بگهینە کوردان

ببێژە ئەز کەچک بووم تاکو بووم پیر
نەدی من خوە وەکی ڤێ سالێ ئێسیر

سەرێ من بوو سپی پووش وپەلاخە
ل ژێرێ من چو نینە غەیری ئاخە

ژ چاڤێن من دچن سەد ئاڤ وسەد جۆ
ژ من ئێدی دکن گازندە زارۆ

خەراب بوونە ژ من سەد خان و قووناغ
نەمایە بۆ پەریشانان دو-سێ ماغ

نکارن بێنە جەم من یەک دو رێوی
دبن دەستادە مانە تە ڤدە سێوی

کورێن من پر ژ خوشکێن خۆرە پاکن
بەلێ پرسێ ل دا پیرا خوە ناکن

جزیر و شەهرەزۆر و گۆر ولۆران
هەمی قیزێ منن پیرێ بقوربان

جوانن سۆر پەرینە سەربلندن
گەلەک ناز و دەلال و گەور ورِندن

بچووکن پڕ شەپالن بەرزەواجن
گەلەک پاکن (ولکن) بێ رەواجن

ژ تەهێڤی دکم ئەی خۆرتێ کوردی
تو ڤان خوشکێن جوان، هێژا نەبەردی

ژ هەر سێکان تو کیژانێ دخوازی
تو ناس ناکی ژ بل ناڤێ مەجازی

قەلەن یەکتی و خوین وخوەندەگایە
تو کیژانێ ببی بۆ تە سەزایە

نە پر مایە کورێ من ئەی جگەرخوین
هوونێ سەربەست ببن مزگین ومزگین

## وەلات دەردێ تە دژوارە

وەلات زانم کـــــــــو دەم بـۆتـە نـەیـارە
فـــەلەک حـــیـــزە ژ لەورە خـــووز وخـــوارە
هەتـا ئـیــــــرۆ دگـــــەل مـــــە تم نـەیارە
شـــەڤ و رۆژان ســـەراســـەر ئەڤ ســتـــەم تێ
نـەبی بـاوەر بـکـی کـــــو نـاحـــــــەسم پـێ

ل سـەر سـینگـا تە سێ چار خـەت کـشـاندن
وەکی بـەرزەخ ژ هەڤـــــدی راقـــــەتـاندن
ل هەر ئـالی مـلێـن مـــــە راشـــــداندن
شـــەڤ و رۆژان ســـەراســـەر ئەڤ ســتـــەم تێ
نـەبی بـاوەر بـکـی کـــــو نـاحـــــــەسم پـێ

ئەگـەر بۆ من بدی دەم یەک دو فـورسـەت
کـو فـورسـەت بێ حـەرامـە ژێرە مـوهلەت
نە راســـــتـــــە ئـەم هەمی بمرن بزلـلەت
شـەڤ ورۆژان سـەراسـەر ئەڤ سـتـەم تێ
نـەبی باوەر بـکـی کـــــو نا حـــــەسم پێ

ل هـەر ئالی دنێــــرم هـەی هەی و شین
کــــورێن تە تـەڤ دبازن: قـــێــــر ونالین
وەکی من ئـەو هەمی بوونە جگەرخـــوین
شـەڤ ورۆژان سـەراسـەر ئەڤ سـتـەم تێ
نـەبی باوەر بـکـی کـــــو ناحـــــەسم پێ

## کیمه ئەز

کیمه ئەز
کوردێ کوردستان
تەڤ شۆرەش وڤولکان
تەڤ دینامێتم
ئاگر و پێتم
سۆرم وەک ئێتوون
ئاگر گها قەپسوون
گاڤا بتەقم
دنیا دهەژی
ئەڤ پێت و ئاگر

دژمن دکوژی
کیمه ئەز....؟

ئەزم رۆژهلات
تەڤ برج وکەلات
تەڤ باژار و گوند
تەڤ زنار ولات
ژ دەستێ دژمن:
دژمنێ خوینخوار
ژ رۆم، ژ فرەنگ
د رۆژێن پر تەنگ
بکوشتن وجەنگ
پاراست، پاراست
پاراست من ئەڤ رۆژهلات
کیمە ئەز...؟

رۆژهلاتێ نێزیک
رۆژهلاتێ ناڤی
ئەڤ باژار و گوند
ئەڤ بەژ وئاڤی
کەت بن دەستی من

پی دا سەر دژمن
من بجەنگ وشەر
زانین و هنەر
پشتا وی شکاند
سەری لێ گەراند
ئەز بووم پادیشاه
خورت وسەر بلند
کەتن دەستێ من تا سنۆرێ هند
کیمە ئەز..؟

کیمە ئەز...؟
کوردێ سەرفراز
دژمنێ دژمن
دوستێ ئاشتیخواز
ئەز خوەش مرۆڤم
نە هرچ و هۆڤم
لێ چیکم بێ شەر
دژمن ناچی دەر
باڤ و کالێ من
دژین تەڤ سەربەست
نا خوازم بژیم

تا ئەبەد بن دەست
کیمە ئەز...؟

دڤێ ئەز دەرخم
دژمنێ خوینخوار
شاهێ ئەفیون کێش
ژۆنترکێ دژوار
سەربەست بژیم ئەز
وەک هەڤچاخێ خوە
دلخوەش بخوم ئەز
رەز وباغێ خوە
چەکان هلگرم دەرکەڤم مەیدان
رێچەک نوو چێکم ژ بۆی ئینسان
کیمەئەز

ئەزم ئێ شکاند لەشکەرێ ریشار
من بخوینا خوە پاراستی ئەڤ وار
دسینگا دژمن ئەز بوومە کەلەم
خوەدان بەر سیا من تورک وعەجەم
لسەر سەرێ من
سنبل و کولاه

سەرێ هەسپێ من
دگرت پادیشاه
ئەزم ئەو گەرناس
ئەو سەلاحەدین
بپرس ژ "دمیاط"
بپرس ژ "حطین"

ئەزم ئەردەشێر
ئەو نۆشێروان
کەسرا یێ مەزن
بتاج و ئەیوان
دوستێ کەڤنارە
کو بوونە دژمن
سەر دتەواندن
بەر ئاگرێ من
ئەزم ئەو قەلاش خورت و پەهلەوان
خەراج من دستاند ژ هند ویەونان
کیمە ئەز....؟

ئەزم ئەڤ گەرناس ئەزم ئەڤ مێرخاس
بەلێ ئەزم کورد

ئیرۆ ئەز مامە
بن دەست و زگورد
ئەو تاج و ئەیوان
تەڤ چوون و رزین
دژمن ناڤ و دەنگ
تەڤ ژ من دزین
خستن لاشێ من میکرۆبێن تەرەس
تا بووم پەریشان بێ ناڤ و نەکەس
کیمە ئەز...؟

ئەزم ئەو کوردێ سەرهشک و هەسن
ئیرۆ ژی دژمن ژ من دترسن
بینا باروودێ
کەتە پۆزی من
دخوازم هاویر
بتەقم ژ بن
دیسا وەک مێرا
بکەڤم چیا
ناخوازم بمرم
دخوازم بگرم
کوردستانا خوە

ئاخا میدیا
کیمەئەز...؟

کاوەی ئاسنگەر باڤ و کالێ من
پەرچقاند سەرێ زەحاکێ دژمن
ژ گەردەنا کورد
وی شکاند زنجیر
سەرێ مە پاراست
ژ برین و شویر
رۆژا هات کوشتن خوین مێژی دلسۆز
گۆیا دبێژن، ئەو رۆژە نوورۆز
زڤستان دچی
ئەو رۆژێن نەخوەش
پارێز دبی کورد
ژ دێوێ زەرگەش
وەسان دبێژی زەردەشتێ رێزان
ئەهریمان دشکێ هرمز تێ مەیدان
کیمەئەز...؟

ئەزم ئێ چێکر ئەڤ جەژن و نوورۆز
دڤێ بستێنم

ولۆ نەمێنم
بگرم تۆل ودۆز
فەرماندارب‌م ئەز
ل سەر كوردستان
بۆ من بمێنن
ئەڤ باغ وبوستان
ئەڤ شاخ و ئەڤ دەشت
رەز و شیناهی
بگرم دەستێ خوە
دلخوەش وشاهی
زانا و خوەندا
دەزگەڤانێن خورت
ڤی واری بگرن
بكن رۆناهی
كیمە ئەز...؟

ئەزم ئەو كاردۆخ، خالدیۆێ كەڤنار
ئەزم ئەو میتان، نایری و سۆبار
ئەزم ئەو لۆلۆ
كاردۆك وكودی
ئەزم ماد و گۆش

هۆری و جودی
ئەزم کورمانج و کەلهۆر، لۆر و گۆر
ئەزم ئەز کوردم، ل ژێر و لژۆر
چەند هەزار سالن
کوردستانا من
پەرچە پەرچە ما
بن دەستێ دژمن
کیمە ئەز...؟

ئیرۆ ژ لۆر و کەلهۆر و کورمانج
ژ دەست خوە بەردان ئەو تەخت و ئەو تاج
بوونە ئۆل پەرەست
بتسبی وخشت
تا دژمن شکاند
ل مە سەر و پشت
مە دان بن لنگان دەولەت و هەبوون
بوون دژمنێ هەڤ پەرچە ، پەرچە بوون
تا کو کوردستان
تا کو کوردستان
ژار و پەریشان
کەتە بن دەستان

کیمە ئەز...؟

ئەزم ئەڤ مللەت، ئەزم ئەژدەها
ژ خەوا دیلی شیار بووم نها
دخوازم وەک مێر
دخوازم وەک شێر
سەرێ خوە هلدم
چ سەر بلندم
بجیهان جارەک
ئەز بدم زانین
رێچکا مارکس
رێچکا لەنین
کورێ گوهدەرز و فەرهاد و روستەم
کورێ سالار و شێرگوە و دەیسەم
بەژن بلندم
وەک دێو بلندم
ئەز دەست درێژم
سەربەست دبێژم
دخوازم بلەز
گاڤان باڤێژم
کیمە ئەز..؟

نەخوینخوارم ئەز، ئاشتی خوازم ئەز
سەرداریٚ مەیە گەرناس و نەبەز
ئەم شەر ناخوازن
دڤێن وەکهەڤی
ئەم پاشڤە نا چن
دژمن درەڤی
ژ بۆ مرۆڤان ئەم تەڤ دوست ویار
بژی کوردستان بمری کۆلەدار
کیمە ئەز...؟

PDF 4 KURD

## رێ دبی بۆست دژمن نابی دوست

دبی کـــــو رێ ببی بۆست
دژمن تو جـــار نابی دۆست
سەد سالی سەربدی پۆست
تم دلرەش وبێ باڤـــــە ئەو

هە چەندە پشت نەرمە نەیار
گـاڤـا تەبگری رەنگی مـار
جارەک ل سەرسەر بێتە خوار
ژەهرا رەش و زەهراڤـــە ئەو

دران ژ هەڤ بدەڤ کــــەنی
شـێر بێـژی بەرخێ :ئەز بەنی
خـاپ و فـەنێ پیس و گـەنی
لێ بەرخ چ زانی راڤــە ئەو

ئێ کێ بی ئەڤ خـوەش رەنگ وەلات
ئەڤ گــوند وباژار وکــەلات
ئەڤ دیـجلە وزاب وفــەرات
قـــاســـە تژی دراڤــە ئەو

کــوردێ کــورێ لۆر و مــەدا
بگری ژڤــر تا ســەرحــەدا
تەڤ مـانە بن دەست وگـەدا
وەک پارســەکێ بێ ناڤـە ئەو

ئەڤ چەرخ و دۆلابێـن دنێ
ڤێ گــەر وچوون و هاتنێ
بالا خـــوە وون چێ نادنێ
گەه شەڤرەش و گەه تاڤە ئەو

## چ ژ مەر دڤێ

کورد پەرچە بوویە وەک بەدەو
لێ شـڤـانەک ژ مـەر دڤێ
ژ بۆ کـو زوو رابن ژ خـەو
بلوورڤـانەک ژ مـەر دڤێ

نایێن ژمـارتن کـەر کـەری
بن دەست و ژار وبێ سـەری
ژ بو کـو رابت بەربەری
چ رێزانەک ژ مـەر دڤێ

ژ بو کــو ئەم تەڤ ببنە یەک
دەستان بدن هەڤ ئەم بچەک
زوو بێنە مەیدان لەک بلەک
قــارەمــانـەک ژ مــەر دڤـێ

رۆژا ببی قـــیـــر و هەوار
ئێـریش بکن سـێنجا نەیار
رەنگێ برووسکان بێنە خوار
چ شـەرڤـانـەک ژ مـەر دڤـێ

دەستـوور دڤێ، قانوون ورست
ژ ناڤ مە رابن کورت و پست
کەسەک نەمێنی خوار وسست
پۆزبـەرانـەک ژ مـــەر دڤـێ

ژ بۆ کــو ئەم بگهــێنە هەڤ
خەبات بکن ئەم رۆژ وشەڤ
کورد بن ب دل و جان و دەڤ
مــەرزبانـەک ژ مــەر دڤـێ

ژ بۆ کو ئەم زوو هەرنە پێش
ب تیپ و تانگ و تۆپ و گـێش
قـادا خـوە بگرن ئەم ل ئێش
وەهـۆزانـەک ژ مـــــەر دڤـێ

ژ بـۆ بن خـــــوەدی وەلات
زوو دەنــگ بـدن درۆژهـلات
بن خــوەدی تیپ وجـڤــات
چ رێـزانـەک ژ مـــــەر دڤـێ

دڤێ خـــەبات بکن ب رک
زمــان و دەست وپشت وزک
هاویر بلیـــزن ئەم ســڤک
پەهلەوانـەک ژ مـــەر دڤـێ

ژ بـۆ نەمـــێن عـــێل و بەر
دڤێ بهـــەڤـــرە هەرنە شــەر
بشـکێ نەیار ئەم بدنەســەر
ئەردەوانـەک ژ مــــەر دڤێ

ژ لۆر و گـۆر و زاز و بەخت؟
بێ پادیشـاھ و تـاج و تەخت
بووکە وەلات خوینا مە نەخت
نژدەڤـــانەک ژ مـــەر دڤێ

ئەو کـوردێ گەرناس و نەبەز
ئـیـــــــرۆ دکـی ھـری بـلـەز
بـێ ئـاڤ و نـان و دار وپـەز
خـوین رژانەک ژ مـەر دڤێ

سـەیدا چنە قـیـرو ھەوار؟
چل سال دبێ ، نا بن شـیـار
پشت خووز و بن بارێ نەیار
رسـتـەڤـانک ژ مـەر دڤێ

بێ مـال و روومەت، دلبرین
ھەردەم بئـــاھ و نـال و شین
جەرگ و ھناڤ تەڤ کرنە خوین
ھرمـــزانەک ژ مـــەر دڤێ

## بسەر چیان کەتم

هەڤال مەگری چیا هەردەم
جهێ خوەش مێر و شێرایە
دیوارێ سەرخوەبوونا کورد
ژ لاشێ خورتە مێرایە

سەرفرازی بلندە، لێ:
بخوین و کۆتەک و زۆرە
بژێردە چوونە بن دەستی
بەرێ کوردان لبەر ژۆرە

تەنێ سەربەستی ئەیوانە
بلند و بەرزە بالایە
تەنێ شوونا سەرێ من، تە
دژۆری وێدە ڤالایە

د کۆرتان دە ئەگەر رازی
تودێ خەونێن خەراب بینی
کراسێ ترس و ساویران
ل خۆکی تم تو خەمگینی

ژ دۆزا خوە ئەم ڤەنابن
دخوازن تا وەکو ساخن
گەلەک شەرمە کو ئەم ساخن
و دژمن هێ ل ناڤ باغن

## هاوار هەوار

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار

هاوار دکم
گەرناس ومێر
کوردێن دشەر
دە رەنگێ شێر
ئێریش بکن
تەڤ وەک پلنگ

ژناڤ خوه دەرخن
وان بجەنگ
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان چووچکان
گەنمێ مه خوار

تالان برن
وان دەخل و پەز
چەپەر چراندن
کەتنه رەز

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مه خوار

هاوار دکم
رانابی کەس
شێخ و مەلا
وپیر و قەس

بخاچ وخشت
ومزگەفت ودێر
ئەم خستنە
تۆرا نەییر

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان چووچکان
دەخلێ مە خوار

سەد جامی و
دێر و کەنشت
ناقۆس و بانگ
وتیر و خشت
سەد لەک ژ
تیپێن لەم تەرە و
بکێرمە نایێن
تەڤ دەرەو

هاوار هەوار
هاوار هەوار

ڤان دژمنان
قادا مه خوار
بدەست تڤنگ
ئەم هەرنه شەر
بشکێ نەیار
ئەم بدنه سەر

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان قومبلان
گەنمێ مەخوار

شەرمه کورێ
میتان ولۆر
قادا مه بگرن
ئەو بزۆر
ناڤداره کو
گەرناسه کورد
ئیرۆ چمان
مایین زگورد؟

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار!

هاوار دکم
گوند وعەشیر
بازاری و
میر و گزیر
دژمن نەخور-
تە هەرنە وا
ئێریش بکن
سێنجا ئەوا

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار

دژمن بزۆر
و سەر بلند

ژ بەر مە گرتن
شار و گوند
نەنان هەیە
نەوار، نە جی
نامووس نەما
ئاپێ حەجی!

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
ڤادا مە خوار

ئەم تەڤدە رابن
مل بمل
ئێریش بکن
دژمن ژ دل
دەستان بپاکی
بدنە هەڤ
وەلات بهێلن
بۆ خوە تەڤ

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مه خوار

ئەم تەڤ برا
ئۆل یا خوەدێ
جۆتێ خوه
بگهێ سەر سەدێ
ئەم بدنه پەی
گەرناس ومێر
تەڤ هەرنه دژمن
رەنگێ شێر

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مه خوار

ئەم پێکڤه وەک
شێر و پلنگ

لسەر چیان
ئەم بدنە دەنگ
خوەش بدنە سەر
پشتا نەیار
بشکێ وبمری
کۆلەدار

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان چووچکان
گەنمێ مە خوار

سەیدا جگەر
تەڤ بوویە خوین
دیسا لمن
دەربوون برین
بشکێ تمی
سەرمایەدار
دلخوەش بژین
ئەم پایەدار

هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار

## حزام زنار

ئەڤ زنارا عەرەبی
کو ل جزیرێ دبی
نە پشتەکە چارتایە
نە بەنەکی بادایە
زنجیرەکە ژ ئاسن
ئەو تاڤێژن ملێ من
دا من ژ قورم ڤە راکن
قادا من ژی لەڤاکن
کورد نەمێنن ل وەلێت
حزام چ قاس ل مەتێت

عــەرەب ئانین گــوندێ من
مـن دژمــــێـــــرن ژ دژمـن
پێک ئانینه ســـال بســـال
ل کـەرکــووک ول شـەنگال
بەعسێن بەغدا بەعسێن شام
ئانین مـــەیدان ئەڤ حــزام
دا پـەترۆلا من بـخـــــوەن
بـــەرە دژمـــن بـــروخـــن
ئەم ســـەدهزار بـێ مکووس
ل جـــــزیرێ بێ نفـــــووس
یەک ژی دەنگێ خــوەناکی
هـەتــا نـەوێـری بـاکـی
ژ برچینا تـێن بێـــــرووت
هـەمـی بـرچی و پـێ رووت
دخـــوازن ببنه کـــارکـــەر
لێ حــەق ژکــار نایێن دەر
ناکن قــــێـــــرین و هاوار
دژمن قـادا مـە تەڤ خـوار

ئەڤ عـــەرەبێن شـــوڤـــینی
کــــوردان مللەت نابێنی
دبێـــژن ئەم هەڤـــپــــارن
دژمـنـێ کــــــــــولـەدارن
لێ ئەو بخـــوە کــــولەدار
لە پێـــچـــان ئەڤ زنار
دڤـــێن مـــە بکن عـــەرەب
بمرن بێ ســـوج و ســـەبەب
گـــەلۆ ئەڤـــە وەکـــهـــەڤی
وەی ســـەد قـــەدا پێ کـــەڤی
نەهەڤــــپــــاری یە زۆرە
تـەنـێ دنـیــــــــا بـدۆرە
رۆژا مـــەژی دەمـــەک تێ
ئەم گـــوە نادن ڤێ خـــەتێ
ئەم نە گــــەلەک نەزانن
ئەم ســـینۆرین خـــوە زانن
وەلاتێ مـــە کـــوردســـتـــان
وەر نامـــێنی کـــۆلســـتـــان

چاڤ بچاڤ و دەست بدەست
چەندان مە ئەڤ نە دخوەست
لێ دژمنێ مـــــە پر هۆڤ
مـــە نابێنن وەک مـــرۆڤ
پـرتەگــــالا كـــــۆلـەدار
وادا دەســـتێ خــوەدی دار
لێ دەولەتێن هەڤـــپـــاری
چاوا بـكـن ڤـی كـــــاری
ئەڤ كــــارێ كــــۆلەدارە
نـەرێزانا هـەڤـــــپـــــارە
نـەدەركــــــــەتـی نـەبـرن
دوەلاتــێ خــــــــوە پـرن
وەلات لـســـەر ناڤێ مــە
ناڤێ كــــال و باڤێ مــــە
عـــەرەب ژ مـــە نا ترسن
ئەوژی وەک ترک و فــورسن
چـاڤ بـەردانـە پـەتـرۆلـێ
تـەڤ هـاتـنـە ڤـێ چـۆلـێ

ئەڤ گـەرناسـێن سـەرچیـان

ئەگـــەر رابن ســـەرپیـــان

زوو دەست باڤــێــژن تڤنگ

بگەرناسی بکن جـــەنگ

رۆژا ئـەم دەست بـدن هـەڤ

بدەست وا نـاکـــەڤی رەڤ

تەنـێ ئەو گــــونەهکـارن

لســـــەرمـــە کـــۆلەدارن

ژ کـــۆلەدار پیـــســـــتـــرن

دۆزامــــــە ووندا کــــرن

نەکــــو دســـــەرمـــەرە بن

دخــــــــوازن ئـەم تـو نـە بن

ئەم نـابن تـرک و عـــــەرەب

چرا بمـرن بـێ ســــــــەبەب

ئەم ئـاری نە، نـە فـــــارس

مــــا گــــەنم دبی گــــارس؟!

ئەم پاش کــەتی، رێ نەزان

ئەم کــەتبـــوون دەست دزان

لسەر مە فەرماندار بوون
لێ تم کۆلێ نەیار بوون
چ قاس پیس و نەزان بوون
لسەرمە خانەدان بوون
ئەم کربوون گورێن هار
تەڤ ژ هەڤرە بوون نەیار
بخەنجەران دچوون هەڤ
کوشتن هەبوو نە بوو رەڤ
تالان و چیر وهاوار
دزان مالێ مە تەڤ خوار
دژین وەک گۆڕنەباشا
لسەر مە شێخ و پاشا
کار بدەستێ نەیار بوون
ئەم ژی نە پرشیار بوون
شێخ و پاشا ، ئەفەندی
پرێ وان ژی نە خوەندی
فەرماندار بوون قەرەقووش
لێ ژ خوەرە پالێن پووش

لســەر مــە پاشــا ومــیــر
لبـــەر دژمـن تـەڤ گـــزیر
ئەو دکــوشتن ب ســێـــدار
وەک مـــرۆڤـــێن دین وهار
نە دان ســەرێ خــوە کــولاھ
یەک ژی نەبوو پادیشـــاھ
زارێ دژمــن دکـــــــــــرن
تـا بـ چـولانـدە فـــــــرن
رۆژی و بـانـگ و نمێـــــــژ
شـێـخـێن شـاشک بقـەرێژ
وەک بـێـگـانا دگــــــوتـن
تا زمــانێ کــورد ســوتـن
وان هـاتـنا مـــە دخـــوار
دچـوون بــەر دەرێ نــەیــار
نێچیرڤان بوون شێخ و میر
نێـچـیــر دان دەست وزیر
گــۆشــتێ قــەلەو بۆ دژمـن
پارا وان هەســـتـــیێ من

والـی ئـەو بـەرددان هـەڤ
مـاکی هەببـو خـوەدی دەڤ

دچوون سـەرهەڤ بئـێـریش
هەڤـسـار بدەسـتێ چاویش

ئـەو پـاشـــــا و دەرەبـەگ
ل بـەر نـەیـاران بـێ چـەک

لێ دەم ژوان ئەڤ دخـوەست
ئـەڤ دکــرن نە ژ قـــەست

ئەو قـــووناغـــا کـــو تێــدە
پـێـشـــڤـــە نەچوو بوو زێدە

عـێل پەرست و ئول پەرست
هەڤ گرتبوون دەست بدەست

عـێل پەرسـتی دەسـپـێکە
پاشـــدەمـــانە، نە رێکە

ئەو قـــووناغـــا کـــۆچەری
تـەڤ کــــوشتن و بـەربـەری

هۆڤــــیـــــتـی و نەزانـی
مــــال وێرانـی، خـــەزانی

هێـــژی نەبـوون بیـــرەوەر
کـــارێ وان کـــوشتن وشـــەر
هەمـی هۆڤ بوون وەکـە هرچ
ســەربپــۆر و ســینگ بپـرچ
دز و خــوینخــوار و کـەلەش
ئەڤ ژین بوان گەلەک خوەش
فـورس و عـەرەب، ترک و رۆم
خوەدی لەشکەر، خوەدی کۆم
ل نک وان چارســەد هەزار
ل جـەم بەگم سـیـە و چار
زۆر دابوون مـزگـەفت و دێر
گـــوە نەدانە تـاجـــا زێر
مــزگـەفت داڤـا نەیار بوو
مللەت ژی نەشـــیـــار بوو
پـــرۆپـــاگـــنـــدا دژمـــن
شێـخـان دخست گـوهێ من
دخست سەرێ من هەڤسار
دخـاپاندن وەک کـەفـتـار

ئەم ژ قــــــولان تـانـين دەر
ژ دژمـن رە دچوون شـــــەر
مـــە مللەتێن وەک بلگار
بزۆر دخـــست دەست نەيار
نهـــا ڤـــا تێ ســـەرێ مــە
مـێــرانيــا مــە کــێــمــە
لـێ ئـەو بـلـگـار و يـەونـان
خـوەدی هەبوون ل پشت وان
تەڤ دەولـەتێن کـــــولەدار
ئــەو ژ وانــرە ئــالــيــکــار
لێ ئەوژی پڕ چەلەنگ بوون
بدژمـنرە بـجـــــەنـگ بوون
بێ کـــــوشتن و بێ زيندان
وەلات نە کـەت دەستێ وان
شـــەڕێن بـەلقــان ناڤــدارن
کــورد ژی پێ گــونەهکارن
شـەڕێن وان ئۆلپــەرەســتی
کـــورد دبرن ژ قـــەســـتی

کـــۆلەدارێن بێ خـــەلات
دا کـــــو بـێنـە رۆژهـلات
ئەڤ شـەر تانینە مـەیدان
گـەه رۆمـان و گـەه یەونان
شـێخ و مـەلان دگـوت مـە
دژمن ئەڤ رۆس و رۆمـــە
هەچی دشـــەر بێ کـــوشتن
ئەو مـــێـــڤـــانێ بهـــشتن
هەزار پەری پڕ جـــــوان
ل بهـــــشـــــتێ ددن وان
کـەچ و کـورێن پر خـوەشک
دام وســـەدرەنج و کـــشـک
چ بخـــــوازی تێ بەر تـە
ئـاکـــــر دژوارە ســــــڕتـە
هەچی ژ دل نەچی شــــەر
دچی نـیـــــــڤێ دوژەوەر
تەڤ ئاگـر و مـشک ومـار
مـرۆڤ دخـوەن هەی هاوار!

ئەو کـورمـانجێ دل بتـرس
دەمـا دبهـیـستن ئـەڤ پرس
وەکـە شـێـران دچوون شـەڕ
دشـــەوتـین هشـک و تـەڕ
ئیسلام تەڤ یەک مللەت بوو
یـەک وەلات و دەولـەت بـوو
نە کـورد هەبوو ، نە عـەرەب
نە راست هەبوو ، نەژی چەپ
رەمـزا سـینور قـەلاشـا
(پادیشـاهم چووک پاشـا )!
ل مـزگـەڤـتـان مـەلین کـۆر
بســەرمـــەدە بۆرە – بۆر
بژی ئیـســلام پادی شـاه
بپــارێزی ئەی خــوەداه
لسـەر مـە کـێم نەکی وی
کـەسـەک نینە وەکی وی
ل سـەر ئاڤێ بێ گـەمی
دچـی، بـاوەرکـن هـەمـی

هەچی کـەسـێن مـوسلمـان
ببـــاوەری بـ ئیـــمـــان
تـەڤ ژێـرە بـبن لـەشـکـەر
کـــەنگی بڤێ هەرن شـــەر
هن لەشکەرێ کـەس نەدی
چ دەرەوەک بـێ فـــــــەدی
وەک قـــەلاش و جــەناور
ئێـــریش دکن ســەر گـــاور
نەراســتــە شـێخ ئەفـەندی
ئەم تـەڤ پالا و گـــــوندی
تێنە کـــوشتن بێ کـــەفن
ئەڤ چ دەرەو، ئەڤ چ فــەن
وەک مـن زمـــــــان درێـژی
کــەس نەبوو وەر ببــێــژی
بەلکی ئەم تەڤ نەزان بوون
ئـەم دلخـــــــوازێ دزان بوون
مـــــە بـاوەر دکـــــــر ژ دل
تـا شـــکـــەســـتن لمـە مـــل

دژمن کـــــەتە ناڤ وەلـێت
دین مللەتەک هۆڤ و شـێت
دڤــــــی وەلاتــــــی دژی
بێ ئـاورِ و بێ مــــــــەژی
عێل پەرەست و ئۆل پەرەست
مــرن ژ بۆ خــوە دخــوەست
خـەسـمـا دەمـا پەترۆل دین
بوون وەک گورێن دەڤ بخوین
وان ژی ئـەم بـەردانـە هـەڤ
هەتا نـەمــا کــەس بدەڤ
دژمـــن بـــەرک بـــرن دام
ل مــە پێــچــان ئەڤ حــزام
ئەڤ عـــــەرەبێن پر نەزان
چ زوو ولــۆ بــوون رێــزان؟!
رۆژهـلات و رۆژئـاڤـــــــــا
هەردوو دانە بەرچاڤــــــا
ل بەرچاڤــان هەڤــپــارن
لێ ڤــا قــادا مــەخـــوارن

ژێـــــر وزانـــــا وزیـــــزن
چـاوا بمـه دلـیــــــــــــزن
دبـن دوســــــــتی بـارزانـی
لـێ رێـزانـێ مـــــــــه زانـی
حـــــزام، زنـار، ل جـــــزیر
کـــو پێکتـــێنن ئـەوێن ژیر
بەعسێن بەغدا، بەعسێن شام
ل سـەر پشـتـا مـە چوون دام
راسـتــە شــەرێ هەڤ دکن
هیـــــمـــــان دمــــەوەر دکن
گـــازی دکن کـــوردێن ژۆر
تـــرک ل وه پـــر دکـــن زۆر
کـوردێن ناڤـمـە سـەربەستن
نـه کـــــــــۆلە وبـن دەستن
ئەوژی وەکـــە مـــە دژین
وون گـوهـ مـەدن جگەرخوین
ئـەمـێ ئـالـی وە بـکـن
بتــــرکـــان رە هەڤــــڕکن

وون ژ مـــه پر نێـــزیكن
ئەم كـــارن وه خـــوەدی كن
بێن وەكـــه ســـــازمـــان
ئەمێ چێكن كـوردســتـان
لێ ئەڤ خــاپێن ئەشكەرا
نا كــەڤن ســەرێن كــەرا
شــاه ژی دۆسـتی بارزانی
لــێ بــارزانــی پــێ زانــی
شەش ملیـون كـورد ل ئیـران
وونـدا دبـن بێ زمـــــان
شاه سـەربەسـتی نادی وان
نادی مــه چەكــێن گــران
كـــو ئەم دژمن بشكێنن
وەلات تەڤی بســـتـــێنن
كــوردێن خـوەناكی مللەت
چاوا مـــه بكی دەولەت
دژمــن هــەمــی وولــونــه
عــــەلونه، یان سلونه

هەمی دڤـــێن خـــوینا مـــە
کـــەســـەک ناڤێ ژینامـــە
دڤـێن کـو مـە ڤـەشـێـرن
دناڤ خـــوەدە بهـــێـــرن
ناڤـێن مـە تـەڤ گـوهارتن
دا ببـــێـــژن نە کـــوردن
لـێ بـزانــە ئـەی نـەیـار
زڤـــســـتـــان چوو تێ بهـــار
ئەو گـــیـــایێ بن کـــەڤـــر
شـــێن تێ رۆژەک دچی دەر
بژین کـوردو کـوردســـتـــان
نەمـــا دبی کـــۆلســـتـــان
لاتا وە ئەوکـــــری پووشت
باران لێ هات هەمی شووشت
کـــورد شـــیـــار دبی بلەز
گـــاڤـــان تاڤـــێـــژی ببـــەز
هاویر جـــڤـــات وخـــەبات
دبن شــــــەرێن رۆژهەلات
هندک مـــایە بێن مـــێـــر
ئێـــریش بکن وەکـــە شـــێـــر

وێ چاخێ دێ چ بێـــــژن

كـــو ئەم خـــوینێ برێژن

كی ژێ بەر پرســـــیـــارە؟

حــســـاب گـەلەک دژوارە

مــلـــلــەتــێ وە رازایــە

یانـژی دخـــەودە مــــایە

رۆژا ببی وەكــــە مـــە

ئەوێ ئـێــــــــریش بـبن وە

حـــســـاب بوەر ببـــێـن

تـۆلامـــــــە وێ هلـێـن

چاڤنێــرین وەنە ســێــدار

ئەی خوینخوارێن گونەهكار

وەرن ئـالـی مـــــە بـكن

ئـەم و وە نـەهەڤــــــڕكن

شــیـــار ببن مـــە بن دین

گـــوه بدێرن جگەرخـــوین.

## دلێ جگەرخوین

ئاگر بکوردستانێ کەت، لەورا ئیرو هاوارە دل
سەد باغ و سەد بستانی کەت، مەندانی بلبل ژارە دل

پێتەک ژ کوردستانێ هات، میلاک و جەرگێ من دپات
ئامان ولات، ئامان وەلات، باوەر بکن خوینخوارە دل

باوەر بکن ئەی یارێ من، هەڤال و هەم گوهدارێ من
هەر گاڤ و هەر ئێڤارێ من، ناخۆش و هەم بێزارە دل

بێزار و پر ناخۆشە ئەو، کنجێن سیەه- گوون- پۆشە ئەو
گەه سینە گەه سەیدۆشە ئەوە، گەه حەیدەرێ کەڕارە دل

گەه ڕستەمە ، گەه حاتەمە ، گەه پادیشاهێ دەیلەمە
بێ یار و دۆست و هەمەدەمە ، لەو مەست و گەردەن خوارە دل

گەه شاهە ئەو ، گەه بێ کەسە ، گەه کوردە ئەو ، گەه فارسە
گەه بەربەرە ، گەه چەرکەسە ، گەه تورکە ، گەه تاتارە دل

گەه چۆل و گەه زۆزانە ئەو ، گەه دێرک و گەه وانە ئەو
گەه شاخ و گەه وەستانە ئەو ، گەه مووش و گەه زنارە دل

گەه ئارە دل ، گەه ئاڤەدل ، گەه تارە دل ، گەه تاڤە دل
مورغێ سەحەر دەر داڤە دل ، لەورا جگەرخوین پارە دل

## زۆر و چاڤ سۆریا دژمن

پشتی شەرێ شێخ سەعید
پاشــدەه رەڤین تەڤ مــرید
خـــوەدان ســــەرێ دیاران
دچوون شـــــەرێ نەیاران

دژمن تەڤ بوو ئار وپێت
بزۆر کـــــەتە ناڤ وەلێت
ل خـــوە نەری ســــەربلند
ئاگــر بەردان شــار و گــوند

سـەردارەکی پر خـوینخـوار
مـێـرکـوژەکی دین و هار
نڤـێـسـیـیـە ئەڤ چیـرۆک
ل سـەر ئادرێسـا زارۆک

دنڤـێـسی، د بێـژی
ئـاهـان پـێـرە درێـژی
مـن ئاگـر بەردا خـانی
ژ هـۆڤـیـتی، نـەزانی

مـن دی زارۆکـەک پەپووک
پەریشـان وپر بچـووک
ژ نـاڤ ئـاگـر درەڤـی
دڤێ کـو زوو دەرکـەڤی

لێ چاوا چاڤ لـمن کـر
خـوە ئاڤـێـتـە ناڤ ئاگـر
نـوو مـن زانـی بـن بـارم
ئەز مـێـر کـوژم خـوین خـوارم

ئەز بوومــــــە وەک جنـاور
دژوارتــرم ژ ئـاگــــــــــر
زارۆک ژ مـــن دتـــرســـن
قــــەت ل ئاگـــر نا پرسن

ناڤێ کـــو مـن ببـــێنی
خـوە تاڤــێــژی ناڤ خـێنی
لێ ئەز چبکم، چ بێـــــژم
تـەنـێ زمـــــــــان درێـژم

نەمـــرید و نە عـــەشـیــر
نە پاشــامــە، نەژی مـیــر
ل هەر جی کـــــورد وەهایە
بێ روومـــــەت و بهــــایە

تەنێ کـــوشتن هوور وگـــر
چ تڤـنـگ و چ ئـاگـــــــر
ئەم نەخـەرجێ شـــەرکـــەرن
پـارامــــــەیە تم مـــــــرن

مــــرن یەکـــە وەکـــە هەڤ
چ ب ئـێـــــــریش، چ بـرەڤ
لێ مـــــرنا بـرووەمـــــەت
ژ بـۆ کـــــــو بـبن مـلـلەت

مـێـــرێ باشـە سـەربکوژ
لســـــەر چیـــان دبی مـــژ
ژ کــــوشـــتنێ مـــەترسن
ل شـــــەواتی مـــــە پرسن

وەکـە شـێــران هەرنە پێش
وەکــە هەڤن شـــەر و ئێش
هـــەی دێ رۆژەکـــێ بمـــرن
ئـەڤ چ تـرس و چ فـکـرن؟

ژ بـۆ ببن ســـــــــەربـلـند
دڤێ بگرن شــار و گـــوند
وەکی شـێــران هەرنە شــەر
دژمـن بشـکـی، بدن ســـەر

وەلات بـزۆر بـخـن دەسـت
لێ ون مە بن عـیل پەرەست
چێکن ژ بۆ خـوە دەسـتـوور
ژ بۆ سـال و دەمـێن دوور

زۆر بدن دەزگـەڤـانی
دا نەمـێنی خـەزانی
نوو خـوە بکن ب مللەت
چێکن ژ بۆ خـوە دەولەت

هەرن رێزا مـللـەتـان
خـوە بگهـێنن دەولەتان
لەشکەر ئەم ساز بکن لەک
تێـر پەرە و هەمی چەک

پێ بپـارێزن سـینـور
ج ئـێ ژێـر و ج ئـێ ژۆر
ببن ب دۆست و هەڤـال
خـوەدی زێر و خـوەدی مـال

دەســـتـــور ببی دیموکــرات
دیمـوکـــــــراتـا رۆژهـلات
قـــاد و خـــوەندن تەڤـــایی
وەکـــــهــــەڤی و برایـی

ســەربەست بن مــێــر و ژن
نـەســــــاویر و نـە ژی جـن
نەکـــەشـــە و نـەمــــەلا
ل مــــە چێنـەکن گـــەلا

نەمـــزگـــەڤت و نەژی دێر
چپکم ژڤێ خـــاچێ زێر؟
تەڤ بهــەڤــرە بکن کـــار
هەمی بـن خــــــوەدی پـار

نەزۆر دەســـتی، نەژی دین
ســەیدا نابی جگەرخــوین

## پارتیزانم

مـن دایە ســەر ڤـێ رێ ژ دل
زانبـــە پارتیـــــزانم ئەز
نـابم خــولامــۆکێ کــەسی
دا زانـــبـــی رێــزانم ئـــەز

مللەت شیـار بوو رۆژ و شەڤ
دەستـان براسـتی بدەنە هەڤ
ڤـێــرین و هاوار بێن ژ دەڤ
وێ چـاخــێ بــۆریــزانم ئــەز

ئیــــرۆ دبن دەســــتێ نەیار
گـــازی وقـــێـــرین و هەوار
تم دەرکـــەتیـــمـــە بەندەوار
بێ مـــال و پر خـــێـــزانم ئەز

بازم چیـــــا کـــــۆزا منە
ســـەربەســـتی تم دۆزا منە
راســـتی و بەخـــا ســـۆزا منە
پر ژیـرەک و پێـــــزانم ئـەز

مللەت شیـار بوو زوو گـهـا
خـــوینا منە گـــرانبــــهـــا
بەلاش وێ نـارژێـنم نـهـــــا
خـــوەش زانبـــە هۆزانم ئەز

گـاڤـا خوە بەردم سەر چیـا
بــگــرم ل بــەر دژمــن ریـــا
بکەڤـــمـــە ئـاخـــا مـــیـــدیا
کـــەیخـــەســرە و بارزانم ئەز

دوزا مــه قـــادا مـــيـــديا
داخـــــواز مــــەهەر ئازاديا
ئەڤ ســتـــەمـــا ها كێ ديا
روســــتـــەم و هرمـــزانم ئەز

دەستێ خـوە باڤـێـژن تڤنگ
ل سەر چيان قێرين و دەنگ
پێشدە هەرم هالان و جەنگ
زانم نـــەپـــر ئـــەرزانم ئـــەز

## دبیرئانینا قازی محمد

خـاکی کـوردسـتـان بقـوربان پر جـوان وپاقـژی
خـوین رژاندن پر کـورێن ته وا لـهـەر ئالی رژی
مللەتێ کورد تا کو ساخه ئەو ژ ڤێ رێ ناگەری
ئـافـــەریـن، ئـافـــەریـن
قــازی مــحـمـد ئافــەرین

ئەڤ نه شەرمه تێنه کوشتن ئەم درێکا پێشکەتن
دا تروومــان زانبی ئەم خــوەش نژاد ومللەتن
دێ بـکـن ئـەم تم بـوی ره، دژمـنـاهـی، بـەربـەری
ئـافـــەریـن، ئـافـــەریـن
قــازی مــحـمـد ئافــەرین

قــومـــبـــەرا زەری ئەتۆمی زەرەیەک نابن ژ دل
سەرخوە ناچی مللەتێ کورد تا کو ئەڤ زنجیر ل مل
کەس بلاڤ لاڤ وبدیلەک ڤی بەری نابی سەری
ئـافـــــەریـن، ئـافـــــەریـن
قـــازی مــحــمــد ئافــەرین

ئەی تروومـان کـوشـتـنا قـازی مـحـمـد کـا چیـە
قـەی عـەدالەت تم وەسـایە حـوکـمێ دیموکـراتیـە
لێ بـکوشتن وبزیندان مللەتێ کـــورد نامـــری
ئـافـــــەریـن، ئـافـــــەریـن
قـــازی مــحــمــد ئافــەرین

## کی هلگریێ ڤی باریێ من...؟

قــەت نەرم دکی دلێ نەیار
ئەڤ گــازی و هاواریێ من؟
پشــتــخووزە باریێ من گـران
کی هلگریێ ڤی باریێ من...؟

هەر رۆژ و هەر ئێڤار وشەڤ
هـاوار ونـالـین تـێـن ژ دەڤ
گـوھ نا دنە دەنگێ مـە تەڤ
هەڤــال وهەم جــیناریێ من

کـــوردێن نـەزان ورێ نەناس
ژارو رەبەن برچی وخـــــواس
پەترۆل دبـندە بێ کـــــــراس
نابێنی خـوەش ڤی کـارێ من

بدەست نـەیار تـۆپ وتڤنـگ
بدار دخـوازم هەرمـە جەنگ
هاوار دکم قـیّـــرین و دەنگ
شکەسـتـیـیـە ئەڤ دارێ من

گــازی دکم کـــوردێن خـەوار
رابن ژ خـەو جـارەک شـیـــار
هـــاوار ل دژمـــن بـــدنـــە دار
تەڤ گــــوندی وباژارێ من

دژمن کـــــو ئەم دەرخن بزۆر
ئاڤـێن چەمــان ئەم ببنە ژۆر
زازو هەکـــــــار وبەخت ولۆر
پر خوەش بکن ڤی وارێ من

ئاڤــا بـکن خـــان وســـەرا
ئەم تێـــدە روونـن وەک برا
دا خـــورت بـکن زێر وپەرا
ڤـی بـنـگـەهـێ دیـوارێ مـن

شاهی بکن ئەم رۆژ و شەڤ
مـاچان ژ لێـڤـان بدنە هەڤ
نوو خوەش دبی رەوشا مە تەڤ
جـــوان دبن دامـــاری من

دا بەل بن بەیبـــوون وگــول
جــارەک نەمـــینن کــول ددل
گـــول بدمـــە یارێ مل بمل
دل خـوەش ببی پێ یارێ من

داخواز چیە ژ سەرخوەبوون..؟!
پـەتـرۆل وهـاتـن و هـەبـوون
بدەست مـەبن هاتن وچوون
پر خـــوەش دبن بـازارێ من

نوو خـــوەش دبن داخ وبرین
سـەربەست وســەربلند دژین
ئێــدی جگەر نـابی بخـــوین
تا کــو دژیم یەکــجـارێ من

## ئەی وەلات

رۆناکی چاڤم پێـــتی چرا خـــەم
چاخم نەمـــایە ئێـــدی چرا خـــەم
هنگی جوان بووم ئەڤ شاخ و باخە
مـــەلهـــەم ددان بەر برین و داخم
ژ بۆ تە ژینا خــۆش وجــوانی
هەمی مــە بۆراند بدل گــرانی

ژینا جـــــوانی هـەمی بـوهار بـوو
وەشم چ خـورت بوو هشم شـیـار بوو
هەرکـەس دخوەسـتم تەنـی توبار بوو
گەش بوو دلێ من تەن بەرخـوەدار بوو
ژ بۆ تە ژینا خــۆش وجــوانی
هەمی مــە بۆراند بدل گــرانی

هەتا جـوان بووم پۆرێ مـە رەش بوو
دارا مە شین بوو گـولا مە گەش بوو
چاڤم ل پێش بوون، ئەڤین چ خوەش بوو
تە دل ژ مـن بر رەنـگێ کــەلەش بـوو
ژ بۆ تە ژینا خــۆش وجــوانـی
هەمی مــە بۆراند بدل گــرانی

ئیــرۆ جــوانی پشــتــاخــوە دا من
ســەرم سـپی بـوو، پیــری گـهــا من
بایێ ئەجــەل هات زۆر دا چرا من
هاتـن وەشـــاندن پەلێ گـــولا مـن
ژ بۆ تە ژینا خــۆش وجــوانـی
هەمی مــە بۆراند بدل گــرانی

بـکول مـــە بۆراند دەمـــێن بوهاری
خــۆشی مــە گـۆراند بئــاە و زاری
شـــــەبنەم ل ژینام نەمـــــا دباری
رۆژ چوویە ئاڤـا شـەڤ بوویە تاری
ژ بۆتە ژینا خــۆش وجــوانـی
هەمی مـە بوراند بدل گــرانی

ژینــا دەروونم دەربــاس بــکــم ئــەز
پەردا شـــــیـــــاری دا ڕابکم ئەز
بپێـشڤە جەنگ بم ئاه مـاچکم ئەز
حــوکــمێ تەتەور لێ بێ شکم ئەز
ژ بۆ تە ژینا خـۆش و جــوانی
هەمی مــەبۆراند بدل گــرانی

## کوردستان

کـــوردســـتـــانێ کـــوردســـتـــان
بـەخـــــچـێ گــــولا ، دەردێ دلا
ئیـــرۆ مـــا یە بن دەســـتـــان
کــــــوردســــــتـــــان بـلـنـدی
هـەمــی بــاژار و گـــــــــونـدی
هەچی کەسێ تە بخوازی دڤێ جانێ خو بتەدی

کـــوردســـتـــانێ کـــوردســـتـــان
بـەخـــــچـێ گــــولا ، دەردێ دلا
ئیـــرۆ مـــا یە بن دەســـتـــان

کــــوردســــــتـــــان پڕ خــــــوەشی
خـــــــوەش دیجلـه ونـیّـــــر دۆشی
نـامـــــــووس دســــــەرێ وی نـینـە
ئـێ تــە ئـەرزان بــفـــــــــــرۆشـی

کـــــوردســــتــــانێ کـــــوردســـــتـــــان
بـەخـــــــــــچێ گــــــــــولا ، دەردێ دلا
ئـیــــــرۆ مــــــا یە بـن دەســـــــتـــــــان

کـــــوردســــتــــانا هلـمــــشـــــتی
ژ زێـر و گـــــەوهـەر مــــــشـــــــتـی
ئـەم لبـــــــەر دەر دەرگــــــــەڤـــــان
دژمـن تـێـــــــــدە رۆنـشـــــــــتـی

کـــــوردســــتــــانێ کـــــوردســـــتـــــان
بـەخـــــــــــچێ گــــــــــولا ، دەردێ دلا
ئـیــــــرۆ مــــــا یە بـن دەســـــــتـــــــان

مـــــــــشــــــــتی ژ پـەتـرۆل و زێـر
دژمـن دخــــــون خـــــێـــــر وبـێــــــر

روونشـــــتی تەخـــتی کـــۆهرەش
ل ســـەر تاجـــا ئەردەشـــــێـــر

کـــوردســـــتـــانێ کـــوردســـــتـــان
بـەخـــــــچـێ گـــــــولا ، دەردێ دلا
ئـیـــــرۆ مـــــا یە بـن دەســـــتـــــان

کــــوردســـــتــــــانا پـر زەنگین
شـــــاخ وبـاغـــــێـن تـە رەنگین
نـە ئـەز تـەنـێ، لـێ تـەڤ کـــــــورد
ژ دەردێـن تـە جـگـەرخـــــــــوین

کـــوردســـــتـــانێ کـــوردســـــتـــان
بـەخـــــــچـێ گـــــــولا ، دەردێ دلا
ئـیـــــرۆ مـــــا یە بـن دەســـــتـــــان

## ئالا من

ئالا رەنگین پیروزی خوەش
تەهلدگرم دچم بمەش
تو لسەر ملێن خۆرتێن جوان
دناڤ تەدە یەک رۆژەگەش
ئالا سێ رەنگی تو
بناڤ و دەنگی تو
نیشانا جەنگی تو
ئەی خۆرتێن کوردان، سلاڤێ لێ بکن

ئیــرۆ مــە تو کــریە هەمــبــێــز
رۆژەک وێ بــێ تــەبــکــن رێــز
ل ئـەیــوانــا ، لــســـــــــــەربــانـا
رۆژا شــادی تو خــەمل وخــێــز

کـــــــەسـک وســـــــۆر وزەری
ســـــــــپــی و گـــــــــەوهــەری
نـیـــــشـــــــانا زەفـــــەری
ئەی خــۆرتێن کــوردان، ســلاڤێ لی بکن

تە بـزیـڤ وزێـر تـەڤـــــــدە کـلـدم
رۆژا جـــــــەنـگێ ئـەز تـەهـلـدم
گـــــەر ئـەز بمرم، گـــــەر ئەز رابم
جگەرخـــــوینـم ســــــەر بلندم

ئـــالا ســـێ رەنـــگـــیـــنـــی
پـیـــــــــرۆز و شـــــــــرینـی
نـیـــشـــــانا مــــزگـــینی
ئەی خــۆرتێن کــوردان، ســلاڤێ لێ بکن

# هەی فەلەک

هەی فەلەک فەلەک، هەی زالم فەلەک
کا ئەو کوردستان، کا برجێن بەلەک
من ناڤێ جـــــەنەت، ژ تە بمنەت
سەربەست و ئازا، ڤا چووم جەهەنەم
تە مـال نەدا مـە، کـا حـەج و زەکـات
من ژی قەت ناڤێ ئەڤ سەوم و سەلات
بـەندێـن قــــانـوونا تە تـەڤ چڕاندن
کـا سـۆزێن تە وەک "عـصـبـە الامم"

ئەڤ هەزار سالن تەم کرن عەبید
تە ئەم خاپاندن بوەعد و وەعید
قەت ژ من پێڤە کەس تە ناس ناکی
باڤێ تە ترکە، دایکا تە عەجەم
هەر چار کناریێ مە بوونە نەیار
بەرێ مە ل تە ڤێرین و هەوار
دەنگێ مە ناکی، بۆچی دەیناکی؟
بەختێ تە ئەڤە، ئەی چەرخا عالەم

وەلاتێ مەیە، خوەشە کوردستان
زۆزان ودەشتە، تەڤ باغ و بستان
قەنجە، خەرابە، وەلاتێ مەیە
بمە پر خوەشە وەک باغێ ئیرەم
مە تێدە کوشتن عەگید و گەرناس
مە تێدە هشتن فێرس و مێرخاس
سەر بەختێ تەبی، ما ئەم نە مێرن؟
نایێ بیرا تە گوهدەرزو رستەم

کا "ئەبو موسلم" شێرەگوھ و مەروان
کا "صلاح الدین" کانی کەریم خان
کا ئەو بەگلەر و ئەو میر و پاشان
کا بەدرخان و خانم و دێسەم

ما نە هێژایە ئەم هەردەم باکن
ئاخ و خوەلیێ بسەرخوەدا کن
یان ببنە دەولەت، یان بێنە کوشتن
یان دل خوەش بمرن یان دل بماتەم

دەرمانێ مەیە خوەندن و زانین
خۆرتێن خوەندەڤان تەڤ بوون جگەرخوین
هەر بژین بژین خۆرتین نوو هاتی
هەر بژی بژی کوردستان هەردەم

**مەهرەجان**

پێکڤـە ئەم خـورتێ جـوانن
تێن ژ هەر شـۆپ وجـهـان
مـەهرەجـان بۆ مـە ژڤـانن
هەربژی ئەڤ مــەهرەجــان
دۆزا مــــــە هەر ئـازادیە
دۆزا مـــە دیموکــراتیــە
دۆزا مـە هەر ئـاشـتـیـە

گــەر بڤین و گــەر جـڤین
یان خـەبات وکـێـفـەرات

هەر دڤێ ئەم هەرنە پێش
هەر دڤێ ئەم هەرنە پێش
بۆ فـــــەلات وبۆ وەلات

ئەم هەمی دووست و هەڤالن
بۆچی بەند و بەربەری
تێکدە نووهاتی دەلالن
ئەڤ چ جەنگ و شەرکەری
دۆزا مە دەولەمەندییە
دۆزا مە سەربلندی یە
دۆزا هەر ئاشـــتـــیـــە

گەر بڤێن و گەر جڤێن
یان خەبات و کێفەرات
هەر دڤێ ئەم هەرنە پێش
هەر دڤێ ئەم هەرنە پێش
بۆ فـــــەلات و بۆ وەلات

ئەم دبستانان بخوینن
کار و پیشیکی هێن بن
باغ وبوستانان بچینن
چیچەک و گول شێن بن

دۆزا مه هەر خوەشویستییه
دۆزا مـه هەر سـەربەستی یه
دۆزا مــه هەر ئاشــتــيــه
گـــەر بڤین و گـــەر جــڤین
یان خــەبات و کــێــفــەرات
هەر دڤـێ ئـەم هەرنـه پێـش
هەر دڤـێ ئـەم هەرنـه پێـش
بـۆ فــــــەلات و بـۆ وەلات

دەست بدن هەڤ ئەم بجارەک
تەڤ د هەمـــبـــەر کـــۆلەدار
پێــشکەڤن وەک پەهلەوانان
لێ بتــەکــتــیک و شــیــار
دۆزا مــه مـــرۆڤــانیــیــه
دۆزا مــه هەر ئەڤـــینی یه
دۆزا مه هەر ئاشتیه.. ئاشتیه

هەر دڤێ ئەم پێـــشکەڤن
هەر دڤێ ئەم پێـــشکەڤن
بـۆ فـــــەلات و بـو وەلات

## رۆژا خوەندەڤانا

ئیـــرۆ رۆژا خـــوەندەڤـــانا
رۆژا مـــێـــران، رۆژا شـــێـــران

کـــوردێن هێـــژا خـــۆرتێن زانا
رۆژا کـــــــورد و پـەهلـەوانـا

دۆزامـــە ســـەرخـــوەبوون
بـــلـــنـــدی و زانـــەبـــوون

یەکـــیـــتی و پێـــشـــڤـــەچوون
رابن ســـەرخـــوە کـــوردینو

رابن ئیـــرۆ رۆژا مـــە هات
بگرن شـــارو گـــوند و کـــەلات

یەک دەنگ یەک دل بچنە وەلات
هەردەم دڤێ بۆمـــە فـــەلات

دۆزا مـــە ســـەرخـــوەبوون
بـــلـــنـــدی وزانـــەبـــوون

یەکـــیـــتی و پێـــشـــڤـــەچوون
رابن ســـەرخـــوە کـــوردینو

ئەم تا کەنگی رازن هەمی		بن دەست بژین ئەم هەردەمی
لاوێن گوهدەرز نەڤیێن چۆپین		رابن ئیرۆ تەڤ روستەمی

دۆزا مە سەرخوەبوون		یەکیتی و پێشڤەچوون
بلندی و زانەبوون		رابن سەرخوە کوردینو

## ئەز نزانم چ بێژم

هەڤـــال ئەز بلوور ڤـــانم
دەنگێ ســـــــازا هوزانم
ژ وە ئـــەز دلـــگـــرانم
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەز بلوورا مـــارکــــسم
دەنگێ رســـتـــا بێکەسم
ژ هێـــڤـــیـــان ئاڤـــزم
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەز داخــوازا (خــانی) مــە
رەوشا نەقشێ (مانی) مە
د ڕســتــێــدە کــانی مــە
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئـارێ دلـێ (جـــــــزیری)
تاڤـــا تۆرا (حـــەریری)
ئـەز نوژەنم بـپـــــیـــــری
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ناکن دەنگێ ســـــازا من
گـــــــوهـ نـادن ئـاوازا مـن
یـــان نـــزانـــن رازا مـــن
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەز مـــوســـایێ هەســـارم
ژ وە تەڤـــــان دلســـــــارم
لـــێ ئـــەز بـــوە نـــکـــارم
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

چمـــان هەمی نابن یەک؟
لەشکەر ناکن لەک ب لەک
کـانین ئەو برجـێن بەلەک
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــژم

هرچ کـــەتنە ناڤـــا رەز
گـــــور ژ هاویر تێنە پەز
ژ خـــــەو رابن ئەم بلەز
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــژم

چنە ئەڤ عـێل وعـەشـیـر؟
نە بەگ مـایە، نەژی مـیـر
ژدژمـنـرە بوون گـــــــزیـر
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــژم

شـێـخـێن بجـبـە وشـاش
خـــــوە ژ ئولێ دانە پاش
هەمی بوونە گــــورنەباش
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــژم

ئەی خـــورتێ كـــو ژ نوو تێ
ئێ كــــــو دناڤ زكێ دی
یان ژی دپشـــــتـــا باڤێ
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ژ بـۆ وە ئـەز ڤـی ســـــــازێ
خـــــوەش لـێ ددم بگـازێ
بـداخـــــواز و نـیـــــازێ
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەڤ داخــوازا مــە پر كــوور
(مـوسی) من ئەڤ برە توور
(عـیـسی) من ئەو كرە نوور
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەز مـللەتم، ئـەز مـــــرۆڤ
سەدێ بیـسـتێ نەمـان هۆڤ
درەشـــــــــینـم بـۆ وە تـۆڤ
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ژ بۆ وە من گــەلەک هشت
هن دیـوان وهن نـڤــــشت
گــول ژ ئاڤێ بوویە مــشت
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــــژم
ســــڤک چوو بوهارا من
زەربــوون پــەلــێ دارا مــن
دوور دوور دچــی یــارا مــن
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــــژم

ســەری ســپی بوویە پووش
پەر شکەســتی قــەرەقــووش
ئەز دنـالـم ل مــــــــەرووش
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــــژم

پـەرچـە بـوونـە لـەک بـلـەک
هەمی بـازێن قـــــەربەلەک
کـەنگی کــارن بن یەک؟!
ئـەز نـزانم چ بـێــــــــــژم

د پەیڤن پر قـــــەلەو
ژدژمـنرەچێلـە کـــــەو
چاوان ســەری دخن خـــەو
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

هەتا دل رانە وەســــتی
ئەز نا بێـــژم بســستی
کـێـر گـهـایە سەرهەستی
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

خـوەندوارێن کـورێـن کـورد
ئەم ل قـــادا خـــوە زگـــورد
بەسن کـــول وخـــەم ودەرد
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

هەمی دەســتــان بدن هەڤ
خـــەبات بکن رۆژ وشـــەڤ
ژ دل دبـێـم نـە بـەس دەڤ
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

وەکـــــە هەڤن ئـەڤ و ئەو
ون گــوھ مــەدن تەڤ دەرەو
مللەت شــیـــار بوو ژ خــەو
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

مـللەت تـەنـێ دکــــــاری
خـــوەش هلگری ڤـی باری
رســتـێ بکی هەڤــپـــاری
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

وون دخــــــوینن ژ بـۆچـی؟
مــــا نابێـنن لهـــــەرجی
جـیــهــان بەربـپــێش دچی
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

دژمن لـهــــەرجی و شـــۆپ
خوەدی تانک وخوەدی تۆپ
ل مـــەدکن قـــۆپە-قـــۆپ
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

نـابـیـنن دژمـنـێ خـــــــوه
هەر تـشـت برن ژ بـۆ خـــوه
ل مـن ســـۆر بـوو کلوخـــه
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

دبـن دەســتـــان هەزار ســال
دانە دژمـن قـــاد ومـــال
بەردن شـــۆپا باڤ وکـــال
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

باڤ وکـــالێـن مـــه نەزان
پەز بەردانە بێ شـــڤـــان
(خـــانی) ببـــوو بلورڤـــان
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

ئەز نە خـــانم، نە (خـــانی)
نە (زەردەشت) و نە (مانی)
لخـــوە کـــر بـار گـــرانی
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــــژم

نە گـەرناسم، نە عـەگـيـد
ئەز شـێخ مـوسم بێ مـريد
لـێ دلـەوكـم وەك بـەريـد
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

درســـتـــێـــدە چ مـــەردم
دل بـــكـــول و بـــدەردم
خـوينا شـەهيـدێن كـوردم
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ڕۆنـكـێـن خـــوشك وديا
ئەز ئاخـينا سـێـوييـا
ئەز گـازنێن ژنبـيـيـا
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەز هێـڤـيـێن گـرتيـيـان
ژانا دلـێ برچيـــيـــان
سـەرما لاشـێن بێ جـيـيان
ئـەز نـزانم چ بـێـــــــــژم

ئەز دخانا (ناپالم)
خوینا سینگا دەلالم
هاوارم نالە نالم
ئەز نزانم چ بێژم

ئەز دەنگێ وان هەژاران
کەتم شاخ وزناران
ئەز ئەو بەنێ سێداران
ئەز نزانم چ بێژم

حەق بزۆرە دژینێ
ئەز دلبێژێ ئەڤینێ
چ تێ ژ ڤێ گرینێ
ئەز نزانم چ بێژم

کەکو، ئەز جگەرخوینم
دل بکول وبرینم
ڤان ئایەتان دخوینم
ئەز نزانم چ بێژم

## سلاڤ ل سفرا حازره

ئەی سوختەیێ بناڤ و دەنگ
دژمن لسەر بالەفرە
پر لەشکەر و تۆپ وتڤنگ
سەیدا ئەوە، ئەو ماهرە

سەدسالن ئەڤ (زەید و عەمر)
جەنگە دگەل ریشا مەلێ
مەرتال ددەست واندە بهەشت
گورزێ ددەست وان ئاگرە

شێخێ کو تاج وتەیلسان
وەرگرتیە رەنگێ خدر
روونشتیە ل برجا بەلەک
شاهێ عەجەم، شاه نادرە

ئەو سۆفییێ دیل ورەبن
سەرقۆت وخواس تازیە
دگری بهاوار وفیغان
شێخێ مە عەڤدلقادرە

جارەک ل شێخ ئەو نا نەری
دا زانبە راست و دەرەو
کنجێ ل شێخ شال وقوماش
کنجێ ل سۆفی چادرە

ئاغا بدەه گوندێن خوەڤە
باوەر دکی کەیخسرووە
تالانکەر و دزو کەلەش
وی دایە سەر رێچا گورە

حـالێ مـە کـورمـانجـا ئەڤـە
ئەم دێ چلۆ سـەربەست بژین
هەر چی کو چوویێ گوه مەدێ
سـلاڤ ل سـفـرا حـازرە

سـەیدا یێ راست و رۆنـیـیـە
لەورا جگەرخـوین نامـیـدار
زانا دزانن ئەو کـیـیـە
ئێن کـەر دبێـژن کـافـرە

## سەرخوەبوونا مریشکان

ل وەلاتێ مـــــەغـــــەرزا
دیـکەک هـەبوو شـــــەهـرەزا
رۆکــێ ئــەو چــوو نــاڤ دیــکـا
ژوانـره گــــــو هێــــــدیـکا

رابـن بـێــــژن مـــــریشـکان
بـەس خــوە بدن ئەنیـــشکان
دیـک ومـــــریشـک بـوونە کـــۆم
بـەرێ خــــــوە دانە جـــــەم بـۆم

لـەشـکەر تـەڤــــدە بوونەلەک
هـن چەلـەنـگ وهـن کــــولەک

بەرێ خـــــــــوە دانە چۆلـێ
تەڤلی کـــۆچ و تەڤ عـــێلێ

تەیرا دی کـــو ناگــــەهان
هاتی لەشکەرکی گـــــران
تەڤـــــدە فــــرین ژ مــــالان
بەرێ خـــــــــوە دانە بالان

ئەو ژی لهـــەڤ بوونە کـــۆم
یەکی رابوو گـــــــۆتە بۆم
ئەی پادیشـــــــاهی تەیران
وەی ســـــــــەربلندێ تۆران

رابەســـەرخــوە تو مـــیـــرۆ
ژ بۆمـــــە بێـــژە ئیــــرۆ
ئەڤ لەشکەرێ بێ ژمـــــــار
گــــــــــەلو هەیە ژێ زەرار

بۆم کـــــەنی وگـــــۆتە وان
بـاکـن بـازێ پـەهلـەوان

هودهود رابووسەرفراز
وی چوو بلەز گوتە باز:

گو رابە ئەی تو بازی
شەه تە ئیرۆ دخوازی
باز چوو جەم شەه ل بانی
دەستێ خوە لسەرهەڤ دانی

گو ئەی خوەندەکارێ من
زوو لمن کە بارێ من
بۆم گۆتە بازێ خوینخوار
بلەز رابە هەرە خوار

بازی رابوو وەکەشێر
فرەک داخوە هاتە ژێر
بازێ تەری برێشی
هاتە جەم دیکی پێشی

دەستێ ویگرت وهەژاند
نتقەک ژێرە درژاند

(ئۆلان سەن نێرەلیسن)*
گۆ ئەم خەلکێ بەدلیسن

(سیزن بووردە نەئیش وار)**
دیک غەیدی لێدا دار
بازی شەهدا خوە ئانی
دیک ژی دارێ خوە دانی

گۆ بزۆر وبگازن
ئەم حەقێ خوە دخوازن
باز گۆ کییە سەرلەشکەر
گۆ تو نزانی ئەی کەر

ئەزم پاشا ، ئەز میر
ئەزم شاهێ جیهانگیر
بازی چوو جەم دیکێ دی
دی کو ئەو ژی وەکە وی

تەڤان گۆ پاشا ومیر
کەسی نە گۆ ئەز گزیر

نەفـــــــەر بـوونـە یـووزبـاشـی
هەتـا گـــــــهـــــا ئـێ پـاشـی

بـــازی رابـــوو چـــوو بــانـــی
لبـــــەر دەســـــتـێ بـۆم دانـی
تـلـوور تـەڤ لـێ بـوونـە کـــــۆم
(قـــال یـا ایـهـــا الـقـــوم)

ئەڤ هاتنە ژ مـــالا خـــوە
دڤـێن ئـیـســتـقــلالا خـوە
بـۆم گـــــــــــۆ بــازێ دلاوەر
گـەلۆ کــیــیــە ســەر لەشکەر

گــۆ تەڤ پاشــا ومــیـــرن
بـێ وەزیـر وگــــــــــزیـرن
بۆم هێـــدی رابـوو ســـەرخـــوە
تـاجـــا خـــوە داســـەرێ خـــوە

گـــو بتـــاجـــا ســـەرێ من
کــەس نـیـنـە هەمــبـــەرێ من

رابـــن وەک پـــەهـــلـــەوانـــا
دێ ئـەم هـەرن ســــــــــــەروانـا

هـاتـــن تـەیـرێــن دوبـراک
باکـــرن کـــوندو قـــراک
گـــــۆ هـوون وەرن بـنـێـــــــڕن
کـــا ئـەم ئـیـــرۆ چ مـــێـــرن

دیکا خـــــوەدا ئەنیـــــشکا
بوو قـیـــر قـیــرا مـریشکا
گـــــو فــــەرمـــــانا وە رابـوو
کـــــۆمـــــا وا ژ هـەڤ بەلابـوو

ئێ کـو کـوشتن ئێ کـو مـان
هاتن گـوندان بێ گـومـان
وان ژی وەکـــــە مـــــە کـــوردان
دەســتێ خــوە ژ بەرخــوە بەردان

عــــەلۆک وتووتـک وقــــاز
تـەڤـــــــدە بـوونـە بـەلەنـگـاز

تەڤـــدە کـــەتن کـــۆخێ رەش
چیـــرۆکـــا مـــە ژوەرە خـــوەش

وەک ســـەیدایێ جگەرخـــوین
هـەمـی بـوونـە دلـبـــــــرین

* تو خەلکێ کی دەرێی ؟
** ئیشێ وە لڤر چیە ؟

## شەرێ دینا

رۆژەک ژ ئـێـن بـهــــــــارێ
روونشــــتــــبــــووم بن دارێ
مـن دی دوکـــــــــەس تـێـن درێ
دوور کـــــــەتبــــــوون ژ پرێ

گـــــــرتن دار وچـوونـە هـەڤ
نـە ناڤـــــجی و نـەژی رەڤ
کـــومک ل هەڤ کـــرن ســـۆر
ل وێ نـــــاڤـــێ بـــۆرە –بـــۆر

ئـــەز زوو رابـــووم ژ بـــن دارێ
مـن خــــــوە بـەردا دەڤـێ رێ

ئەز کــــەتم ناڤـــــبـــــەرا وان
چاوا دیتم راوەســـــــتـــــان

مـن دی کـــو هەردو ژی دین
دەست وسەری، هەمی خوین
من گـــو: هەی مــــالک وێران
وون ژ هەڤـــرە وەک شـــێـــران

خەلکێ مالێ وە تەڤ خوار
وون ژی ل هــــــەڤ ددن دار
گـــــــو راست دبێ ئەزبەنی
شـــەیتـــان ب مــــە دکــەنی

ئەم هەرد وژی هوّڤ ودین
وەرە تو مــــــە ل هەڤ بین
ژ من رەگـــــــو: ئێ دەڤ لال
ژ گـــوند ڤـــردە بوون هەڤـــال

ئەم گـــــهـــــانە دەرێ هان
پێـــــرە هەبوو هنەک نان

مـن كـــــر نەكـــــر نـەدا مـن
گـــو: بەس ئەڤــە كـــەدا من

والـــلــە بمـــری نـــادم تــە
دەخـــــــوە بـگـرە هـاتم تـە
چـونـە هـەڤــــدی وەک بـەران
ئەڤ شـــەر ژ بۆ گـــەزەک نان

ئـێ زک مـــــــەزن وبـاوی
رابـوو دارێ خـــــوە داوی
گـــۆ: بشـکـینـە ســـەرێ من
هـــا ، ژ تـــەرە پـــەرێ مـــن

گـــــو: نـا ، ئـەز تـو بـرانـە
نـــەبـــرایـــێ پـــەرانـــە
ئەم ب هەڤـــرە بوون هەڤـــال
چنە پەرە.. چيـــــە مــــال؟

گــــازن وان کـــرن ب دەڤ
پـاشـی چـوونـە رووێـن هـەڤ

بوو تق-تقـــــا کـــــەنێ من
ل زک ســـــــست بوو بەنێ من

من گـــو: لاوو ئافـــەرین
کی دبێـــژی کـــو ون دین
خـــوەزی بەگ وئاغـــێن کـــورد
وەک وە بمانـا زگـــــــــــورد

بەلکی ل هەڤ بهـــــاتا
بکەتا ناڤ جــــڤـــاتا
ئەڤ پاشــا و بەگ ومـــیـــر
تەڤ ببـــــــوونا وەک وە ژیر

خوەزی شێخێن خوەدی دین
هـەمـی وەک وە ببن دیـن
بەلکی ئەم وان بکن یەک
خـــوە راپێـــچن ئەو ب چەک

بکەڤن ســـــــەر دیاران
بکن شـــــــەرێ نەیاران

بەختێ کوردە مال مەزن
ژ ملەت رە تەڤ دزن

ژ دژمنرە تەڤ رەنجبەر
شێخ وبەگێن خولی سەر
وەک وە نکارن ئەوتەڤ
هەرن لەپ و رووێن هەڤ

بین یەک پارتی وبەند
ل ناڤ خەلکێ سەر بلند
قێرین بدن زناران
ئێریش بکن نەیاران

دژمن دەرخن ژ وەلێت
لێ مخابن نەوەک شێت
چقاسی ئەم دباکن
لێ ئەو دەنگێ مەناکن

چل سالە ئەز بقێرین
ژ بەر وە بووم جگەرخوین

## دینێ مه تێته زانین

نفـــــرینەکێ ژ یەزدان دکم، تـو بێـــــژە ئـامین
شـــێخ و مـــەلایێ کـــوردان بەلەنگاز و گـــەدا بن

لەورا یـەکی ژوانا قـــــانـوون بزارێ کـــــوردی
ژ بـۆ مـــە چێنەکـــر قـــەت، ژ بەر ڤێ ئەم نەزانن

خوە پیر دکن دوەعدێ هەم سەرف و نەحو و مەنتق
بێ زار و خەت و خـوەندن، لناڤ خـەلکێ دەوارن

پاییـز وهەم زڤـــســـتـــان هەرسێ مـــەهێن بـەهارێ
هەردەم دکن مـــــتـــــالا، داخــــواز ژ وانرە هاڤین

هەردەم دبـێـن ئـەمـن ئێ کــــــو وێـرسێ نەبـینـە
لێ دەف وچەرخ وگـوڤـەند وان کـرنە ئایینا دین

دبێن ئەگەر بکوردی، علم کو بێتە خوەندن
ئەم دێ بین قزلباش، کورد وبخار وماچین

فەقی بخوە نەزانە، سەیدا دنیری قاموس
هەر یەک بدل دبێژن ئەم مفتیێ زەمانن

بکوردی گەر بخوینن، بێ رەنج وبێ گرانی
بێ قەید وشەرح وحاشی جاهل بخوە دزانن

دینێ مە تێتە زانین بهەر زمان وهەر خەت
بکوردی یان فرەنگی یا خود بخەتێ لاتین

"واللە" بووم جگەرخوین ژ دەردێ شێخ وسەیدا
قەلەم دگەل زمانم هەردەم بئاخ ونالین

## ئەڤ ئاوا دۆم ناکێ

ئەی دەولەمەندێ سەربلند، ما تە چما سەر دایە خەو
پڕ زێر و مال و ملک و گوند، بۆچی دخوەی تم نان و دەو

جارەک ل ئەوروپا بنێر، هەرچی خودان ملیۆنێ زێر
چاخا کو تێ رۆژا وەلات، زێرا ددن مەردانە ئەو

رابن لوە ئیرۆ خەبات، چێکن دبستان وجڤات
ئەم ژی دگەل وە بۆ وەلات، زارۆک بخوینن رۆژ و شەو

ئیرۆ خەبات کارێ وەیە، لەورا کو شانس یارێ وەیە
هەر کەس دبن بارێ وەیە، پەیڤێن وە راست ئێن من دەرەو

دیسا جگەر من بوویە خوین، دین چوو ژ دەست من مامە دین
بۆ من وەلات شێرین وزین، هەر شەڤ لسەر نالین و تەو

## دەروێش خوە نادی پێش

گـورمـینە دەرویش هار و دین
هاوار دکی قـــێـــرین و شین
سـاڤـار و نیـڤـشک ژێرە بین
برچینە زارۆک تەڤ ل مـال

کەشف و کەرامەت قەت نەما
چەندا بکی رەقس و سـەمـا
دل نەرمـیـیـا خـەلکێ نەمـا
عـەربانە بوویە وەک قـەپال

بەس قــیــر بکە دەروێش رەبن
وەک رووڤـیـێ پر خـاب و فـەن
هەر کـــەس دزانی داڤ و بەن
نەمانە ئەڤ رەنگ سرِ و حال

کـاهەی هەی و ئەو حـال و سرِ
شـێخ و مـەلا تەڤ بوونە گـور
دژمـن زۆرا، ئـۆلا مــــــــە برِ
فەرمان لوان راکـر (کەمـال)

بنێــرە شـــیخ و ســۆفـــیـــیــا
بـچڤ دچن وەک رووڤـــیـــیـــا
خـــوە دانە تـەنـگالا چـیـــیـــا
تەڤ دین و مـەزهەب بوون بەتال

کـا نەقـشــەبەندی، قــادری؟
تەکـــیـــا کـــرن خـــانا کــەری
خـــوە ناڤـــێـــژن ناڤ ئاگـــری
ئەو شێر و ئەو شاه و شەپال

کا ئەو سرِ و ئەو زکر و خشت؟
بازبەند ل کـوو مـا کـا نقـشت
دژمن بدەست شێخێ تە کوشت
بێ فـێدە چوون ئەو ماه و سال

ئەڤ دزە یان دەروێشـــــە ئەو
رەنگێ مریشک و مـێشە ئەو
دەردو بەلا و ئێــــشـــــە ئەو
سەرپۆشێ جـەژنا کـەرنەڤـال

پیــــسی بناڤێ شـــێخ دکی
شـــێخ ژی بســـەردە رێخ دکی
وەک رێخ و شـێخ ومـێخ دکی
بێ جـبـە و شـەروال وشـال

عـەربانێ باڤــێـژ وەر بخــوین
ژەهرە وە خـــســتـــە ئۆل و دین
هەتا جگەر من بوویە خـوین
وەلات بخـــوازن ئەم هەڤـال

# چبكم بـرۆژى و نمێژ

تازى مــه، برچى مــه مــه‌لا
چبـكـم بـرۆژى و نمـێـــــــــژ
كـــــــۆم بـوون لـن دەردو بـه‌لا
چبـكـم ژڤـێ ريشـــــا درێژ

ته ئه‌ز كـــرم كـــولێ نه‌يار
ته ئه‌ز ژ بانى برمـــه خـــوار
بن دەســتێ دژمن مـه‌ست وژار
دەرمان چيـه كار وەر ببـێژ؟

کـورتان ل مـل ئەز بوومـە کـەر
بـارێ نـەیـاران تم لـســـــــەر
پشـــتـــا منە ئاھ و کـــەســەر
بییر و مژی تـەڤ بوون قەرێژ

بـانـگا تـە یـا ســــــار و رژی
قـــەت ئاگـــرێ دل نـا کـــوژی
ئەڤ کـــار ببـــانگی نـا پژی
ئەی ری درێژێ دین و گـێـــژ

من ئەڤ نڤشـتـێن پەل گـەمار
خوەش خوەندنە هەر یەک دوجار
زانم دوانـدە نـیـنـە کـــــــار
ئەز ڤێ دبێـــژم هێ ژمـــێـــژ

بـن خــــــوەدی تـۆپ وتـڤـنـگ
هەردەم ل کـــار بن وەک پلنگ
رۆژا بـبی هـاوار و جــــــەنـگ
مـێـرانە خـوەش خـوینێ برێژ

هەڤبانگ و هەڤسازێ تە مە
هەڤخوەندن و رازێ تەمە
ئەز دۆست و دلخوازێ تەمە
تەنوور مەدادا نان بپێژ

بێ جی مە ئەز، بێ کنج ونان
ئاور وەزا و بێ دران
لبەر پەزێ وە بووم شڤان
هێژی نەزانی، هێژی هێژ

من دۆتی یە من خوەش مەیاند
من خوەش نخامت وخوەش کەلاند
من ئەو کرە روون وحەلاند
دژمن ژبۆمن هشت دەوێژ

قەسر و سەرا و قاد ورەز
مال و سەوال و دەخل وپەز
هەرچی بگوشت و دۆن و بەز
بۆ خۆ برن، بۆ من کەلێژ

## فالا قەرچییێ

رۆکێ یەکی قـــــــەرەچی
رەش و پێـــخـــواس وبرچی

کنجـــول کـــەڤن و زیڤـــاری
بـــدەســـت دارەک چـــنـــاری

بـەژن زراف، پیـــــــــر و رەق
دەڤ ولـــێـــڤ وروو بـــدەق

کـــەچا وێ لســـەر ملێ وێ
ســــەرژێر بوون هنگالێ وێ

دەرەوکـــــــەر و هەم بێ ئۆل
ببـــەرپشـــــتـــا وێدە پۆل

مـــێـــر و ژنـێ ناڤــا گـــوند
لێ کـــووم بوونه وەکـــه کـــوند

هەر یەک ژێرە تشـــتــــەک بر
پیـــری فـــالا خـــوە ڤـــەکـــر

وان چ گـــوت و وێ گـــو تەو
فــــالا پـیـــــرێ تەڤ دەرەو

پاشـێ هاتە مــــــالا مـــــه
کـا گـەشت و سـەرسـالامـه

مـن ژی دایـێ هنەک جـــــــه
وێ راهشـــــتـــــه پۆلا خــــوه

پۆلێ کـــەڤن و پر خــــوەشک
تێـــدە هەبوون سێ قـــولک

تلیـــا خـــوە من دانی ســـەر
پیـرێ خـوارن چەند کـەســەر

پیــرا وەکــە مــەلکەمــووت
نێـــری پـۆل وپاشـێ گـــوت

ئەی ســەیدایێ جگەرخــوین
فـــــالا تـە وەک دوورەبـین

تـە بـارەکـی پـر گـــــــران
دایە ســەر خــوە بێ گــومـان

ئـەڤ نـە بـارێ یـەک و دوو
دەڤ ژێ بـەردە بەســـــە لـوو

ژ بـۆ بـارو کــــــــارێ تـە
هـەمی کـــــەس نەیـارێ تە

کـورمـانج تەڤـدە مـێـر و ژن
ئـــەو ژبـــۆنـــا دژمـــن

تە دڤێ کـــو ئەو ببن مـــێـــر
خـــوەدان تـەخت وتـاج وزێر

بیـــەک جـــان و دل و دەنگ
دگـــەل دژمن بـکن جــــەنگ

تەڤـــدە بدن ســـــۆزا خـــــوە
زوو بخـــــــوازن دۆزا خــــــوە

وەکـــــە مـــــێـــــرا ببن یەک
بدەست بگرن گــــورز و چەک

لســـــەر چیـــــان ببــــــازن
دۆزا خـــــــوە تم بخـــــــوازن

ژ کــــەرمـــانێ تا (فـــەرات)
(مـــوصل) بگرن تا خـــەلات

یەک ســـەرداریێ خـــۆرت و ژیر
لجـــــــــەم روونـن چەند وەزیـر

ژ بۆ کــــورد و کـــــوردســــتـــــان
ئاڤـــــا بکن دبســـــــتـــــــان

دا بخـــوینن کـــەچ و کـــور
چێـکـن تـۆپ و بـالـەفـــــــڕ

خـــوەندەوارێـن قـــەنج و بـاش
لپـــێش لـەشکـەر بکـن مـــارش

وەک ســـەیدایێ جگـەرخـوین
بـکـن هـاوار و قــــێـــــرین

## مەلا رابە

خـــــوەنـدا و زانـايـێ وەلـێـت
تا کـەی دخـەودە بی مــەلا؟
هـاویـر دخـــــان و ئـار وپـێـت
مـا راسـتــە تم وابی مـەلا؟

مللەت سـەرانسـەر مـا يە ژار
کـــۆلە و بن دەســـــتێ نەيار
هەردەم دکی قـــيـــر و هەوار
جـارەک شـيـار نابی مـەلا

تو رێبـــەرێ کـــوردێن رەبەن
مـــا نابینی زنجـــیـــر و بەن
دمـــرن ل چۆلان بێ کـــەفن
دیســـا تو رانابی مـــەلا

ژ دەست مەچوون فەرمان ودار
کـا خـوەندەگـاه و خـوەندەوار
برچی وتـازی رەنگێ مـــــار
تم چاڤ ل دەسـتـا بی مـەلا

گـاڤـا کـو دەزگــەه هین ببی
قەی گاور وبێ دین دبی...؟!
یان رەنگێ رووس وچین دبی
هشــیـــار وزانا بی مــەلا

دژمن بخـــوەندن بوونە مـیّـر
هاویر خوە پاراست رەنگێ شێر
پەیدا کـــرن وی مـــال وزێر
لەو زۆر ل وی نابن مــــەلا

زوو هین ببـــه تۆپ و تڤنگ
ل سـەر چیـان بقـیـر و دەنگ
بدوژمنـره بکه تـو جــــەنگ
هێ نوو تـو سـەیدا بی مـەلا

خـــوه چەنکه باژێرێن مـــەزن
وون کـــــار بکن هـەزار وەن
بـاوەر بـکـه جـــــارەک ژ مـن
تێ ژیر و هوســتــابی مـەلا

بنێــر کــەلەمــپــەر، با دبی
چـوقـلـی ژ بــەر ل بـا دبــی
لـێ دار بـژۆرڤــــــــه رادبـی
دڤــێت کــو زانا بی مـــەلا

هەردەم بـەره بـایێ بـهـــــــار
بقــــیـــر وفـــزفـــز و هەوار
ســەر ژێره خــوار ناکی زەنار
قـەت چارە لێ نابی مـــەلا

مللەت کـو شـەر دکن هەمی
ئێ قـەلس سـەری دشکێ تمی
بێ تانک و بێ تۆپ و گـەمی
نابی خـوە ئازاکی مـەلا !؟

ڤـایە تەرکـتـۆر هاتە کـار
جـۆتار ژ هەڤ کـر تار ومـار
جـارەک ژ خـەو نا بی شـیـار
جۆتێ مە ئێ گا بی مەلا !؟

## فاتێ ومەلا

ئەڤ چ ریشە، ئەڤ چ شاشە؟
یا مـن بەردە، یا بتــــەراشـــە
ئەڤ چیـــە بەردایە پاشـــە؟
ژێرە ناڤـــێـن جـــیم ولام

ئەز بڤێ ریشێ وشـــــاشێ
بێ ئزن دگـــهـــێـــمـــە پاشێ
پێ دخـــوم مـــوچ ومـــەعـــاشێ
ســـــەر بلندم پر کـــــرام

ئەز بچـــــووكم نووجــــوانم
پر بڤـــان ئيـــشـــان نزانم
لێ ژوان ئـەز دل گـــــــرانم
ئەز دڤـــێم خــەرم ومـــەدام

ئەز مــەلامــە ئەڤ حــەرامن
بەس ببـــێـــژە ڤێ لبـــامن
شــەربەتا لێــڤـــان تەدا من
نازكـــا شـــيـــرين كـــەلام

نازكم ســەرمــەست وگــێــژم
ئەز ژ دەڤ شـــەكـــر درێژم
تم دخـــوازم راست ببـــێـــژم
من دڤـــێتن ناى وجـــام

رى سـپى مـە ، ئەز مـەلامـە
ئەز خـودان سـەوم وسـەلامـە
ئەڤ دئۆلا مـن حـــەرامـــە
بەس ببـــێـــژە ئەز خــولام

ری سپی بوو، پیر وکالی
روو ژ رِندی مایە خالی
رۆژ وشەڤ هەردەم دنالی
ئەز دەلال ومەشخەرام

مەش خەرامێ، ئەز خولامێ
دل ژ من گرتی بدامێ
گوهـ مەدە ڤێ نای وجامێ
تۆتیا ئەیوان مەقام

توتیا ئەیوان بلندم
پرِ شەبالم ئەز لەوەندم
نازەدار و گەور و رِندم
من دڤێت مێرەک تەمام

ئەز چلۆمە، قەی نەباشم
جبەپوشم، سەر بشاشم
تا کو ئاشی ئەز قەراشم
ناڤ و دەنگم چوونە شام

دێ چکم ئەز ناڤ وەدەنگا
دل دخوازی رەوش ورەنگا
ئاوڕێن شێر وپلنگا
دێ چکم کالەک حەرام

گەر چ کالم، دل جوانم
ئەز دڤێ رێ پەهلەوانم
دلبژینێ خوەش دزانم
دل بشەوق و پڕ هەیام

پیرو کالی، کەڤنە واری
تەڤدە بووری، بویە ئاری
قەت بڤی کاری نکاری
کالە مێرەک بێ قرام

وەر مە بێژە، ئەز شیارم
وەک بزۆتم، پێت وئارم
ئەز دڤی واری لکارم
ئەی شەپالا روو ژ خام!

ئەز جـــوانم، تـەرح وكـــاتم
پر شـــيـــرينم وەک نەباتم
نـە ژبـۆ مــــــالـێ تـە هـاتم
مـن دڤــــــێـتن زەوق وتـام

ئەز مــەلامــە، دەولەمــەندم
شـێـەخـەکی پر مـال وگـوندم
ئەز لـهـــەر دەر ســــەربلندم
ئـــەی دەلالا بـــســـک ژدام

ســـەد تف و ئەڤ مـال وزێره
دێ ڤـەکم ســينگێ ژ کێ ره؟
من دڤێ یەک خـورتە مـێـره
ئەز دژینێ نووگــــهـــام

پر شـيـــرينی، نووگــهــايی
وەر لـنـک من، پر بـهـــايی
لـێ تـو ئـيـــــرۆ ئەژدەهايـی
ئەز دنـێـڤ بەنـدا تەمــــام

دەڤ گـــەنی بـوو، بێ درانی
راست دبـێــــژم، لێ نـەزانی
پـەردەیـا شـــــەرمێ هلانـی
مـن تـو ناڤـێ والســـــلام.

## ئاڤا حەیاتێ

مەی گەرا ئاڤا حەیاتێ، مەست ودیۆانێ تەمە
سۆرگولا باغێ خەلاتێ، مورغێ بوستانێ تەمە

سوسنی، یان چیچەکی، یان رەیحانی، یان یاسەمین
بلبلێ مەست و حەزینم، دەر گولستانێ تەمە

حۆریا رەش کاکلی، ئەبروو کەڤانی و رۆژەروو
خوەش پەریشانی وەلێ، ئەز تم پەریشانێ تەمە

گەر تو زین و شاهێ خوبان، تەخت و بەختی عەشق و دل
گەر شیرینا شاهێ کوردی، ملکێ ئیرانێ تەمە

رستەمێ ئیرانێ عەشقی، خۆسرویێ زێرین کولاه
کەیقوبادێ ملکی فورسی، کوردێ بێ جانێ تەمە

دەر دل وجانی جگەرخوین، شاه سەلاحەدینێ کورد
گەر تو بەتلیسا وەلاتی، ئەز شەرەفخانێ تەمە

## دسەر چاڤێن مەرا هاتی

تو هاتی لیڤ شـــــرینا من
ئـەڤـین و دل رەڤـــــــینا مـن
وەرە خـــــوەشکـە برینا مـن
دســەر چاڤــێن مــەرا هاتی

بخـەمل وخـێـز تو وەک زینی
شـەپال و شـەنگ و شـێـرینی
ژ داخــــــــوازێ رە دوور بـێن
بــدیــدارێ پــەت ولاتـــی

بدیدارا خـــــوه پـر رِنـدی
بروو هەیڤ و شەکەر خەندی
دڤێ رێدە هنەرمـــــەندی
ببەژنا خوە تـو شەمشـاتی

ژ من جـان و جگەر کـوشتن
دل و مـێـلاک هەمی مـشتن
تەژی تیـــر و بەر و خــشتن
بەسـە ئەڤ مالە مـیـراتی

بەســە ئەی دلبـــەر و گــاور
بـبــــــــارینـە لمـن ئـاور
تە جــان و دل کـــرن ئاگـــر
بتـــــالان و ببـــــەرباتی

تە مــا چەک دا بشـــیـــرانی
مـــەجــان و دل لســـەر دانی
ئو گـــاور هێـــژ دبێ کــانی
تە قـاتەک دا بسـەد قـاتی

بەسە سەیدا، چنە گازن؟
ددلدە تیر و رِم بازن
مە خەو نایێ، چلۆ رازن؟
دڤێ جەنگێ دە شەهماتی

ببەژنا خوە نەیا ئاڤی
ژ برجێ دەرکەڤی تاڤی
دهەر چاخ و دهەر گاڤی
تو ناز و ترحک و کاتی

بنازداری تو وەک شەنگی
سپی زەندی، شەفەق رەنگی
چ پادی شاه و سەرهەنگی
دکی زورێ لمن تاتی

لبەرتە تات و جۆتارم
مەگەر ئەز ژار و بێزارم
ل بەژنا تە ئەڤیندارم
ل تە پیرۆزە پاشاتی

ل تە پیــــرۆزە ئەی دلبـــەر
کو مال و جـان و دل یەکسـەر
مـــەدان بەر پێ ئەڤین پەروەر
ئەزم رِندێ خـــــەراباتـی

خـــەراباتم ژ مـــەیخـــانێ
مە مەی دا (ئەحمەدی خانێ)
(جـزیری) فـرِکـە فنجـانێ
ژ کـووپ و گـوزکێـن (باتی)

ژ کـووپێ دەسـتێ کـۆلـخـۆزێ
پەری رەنگێ، شەکـەر سـۆزێ
مـە مـەی نۆشی گـهـام دۆزێ
دو سـێـڤین سـۆرە ئەخـلاتی

ڤـەخـواری من ژوان لێـڤـا
شـەراب و شـەبەتا سـێـڤـا
گـەلۆ کـەس دی ژمن پێـڤـە
گـهـا بەژنا لـهـەڤ هاتی؟!

هزار و ســـەد ئەڤـــیندارن
دڤـــێ رێـــدە بـــریـــنـــدارن
بقـــێـــرین و بهـــاوارن
تەنێ ئەز خـۆرت و ژێهـاتی

دڤێ رێدە گـــەلەک مـــێـــرم
پلنگ و ئەژدەر و شـــێـــرم
بتـــاج و گـــەوهەر و زێرم
بەسـە سـەیدا (ئەبووقـاتی)

(جگەرخوین) بەس بکە فۆرتا
تـو پیـــری لێ وەکی خـــۆرتا
تــە دل دا بـەر شـڤ و رۆتـا
بخـــوە کـــۆهێ(ئەراراتی)

## یار هات جڤینا من

یار هات جـڤــینا من بشــەڤ
شـــەبنەم ل نەســـرینان رژی
چیـچەک وەشـاندن وێ بدەڤ
سـونبـول ژ شـەرمـان راهەژی

نێــرگــز ببــەیبــونـان کــەنین
ســۆرگــول ژ لێـڤـان پشکڤین
چۆل تەڤ لبەر پێ بوو بەهار
هەر دەر ژ بینێ مـــاتەژی

دۆزا جــــوانێ جـــانه، لێ
جـــامـــا لەبالەب دایە من
مــاکی ژ لێــڤێ ئەرخــەوان
جــامــا شــەرابێ نامــژی؟

جـــامـــا شـــەرابا لال و درِ
من لێڤ بســەر لێــڤــان دەبر
سێ سەد قەدەح من ژێ ڤەخوار
تینـا دلـێ مـن نـا کــــوژی

دلخوەش دبوون، روو گەش دبوون
بێ هش دبوون، سەرخوەش دبوون
بێ ژین وڤین و لەش دبوون
ئێ یار بدەست کەت کا مژی؟

پشــتی گــهــام ئاڤــا حـەیات
بهش خــوە هاتن تەڤ لەبات
مـێتن ژ دەڤ قـەند و نەبات
بهشتـە ئەڤ شـەڤ هەر بژی

پشـــكـوژێ ڤـێ ژيـنـێ ئـەمـن
بەيبــوونێ چێــبــوونی ئەمن
دلســـۆژێ ڤێ چوونێ ئەمن
لێ هێــژی جــاندار نا پژی

بـۆچی دبـن پـەردا شــــــەڤێ
بگـهـێـمـە ڤێ شـێرين دەڤێ
وێژی وەكـی مـن ئـەڤ دڤـێ
دا كــو بشــاد و خــوەش بژی

## چەپ و راست

مـــەی گـــەران مـــەی دگـــەراندن چەپ و راست
مـــەی خـــوەران مـــەی دفـــراندن چەپ و راست

ســـۆر پەری تێـن و دچن، گـــەزمـــە و تیـــر
ژ کـــــــەڤـــــــانـان درژانـدن چـەپ و راسـت

هەی و هۆیێ ســـەرخـــوەشـــان، دەنگێ دەفێ
خـــوە ژ چاڤـــان دەرڤـــانـدن چەپ و راست

ســـەرخـــوەشـــان دەست دبـرن ناز و کـــەچان
مـــــــە تـەنێ مـل دهـەژانـدن چـەپ و راسـت

تەنێ گـــوڤـــەند وســـەمـــا ناز ولـەوەند
بـگـرانـی دکـــــــشـــــــانـدن چـەپ وراسـت

زوو بـزوو هەڤ دبـرن، شـــــەکــــــەر و مــــــەی
لـیڤ ژ لـێــــــڤـــــان دمـــــژاندن چەپ وراست

سێ گــــولی، بسک و گـــەزی مــــارێن درەش
ســــەربســــەر مـن دخــــەلاندن چەپ و راست

رووپـــەری ئــاورٍ ژ هــاویــر ڤـــــــــــــــەددان
تـیـــــــر ددلـدا دفــــــــرانـدن چەپ و راست

گـــەزمـــەیێن چاڤــێـن درەش، جـــەرگ وهناڤ
ل مــــــە کــــالان د حــــەلانـدن چەپ و راست

بسک بتــێـــلا، کـــوفـــیکێـــلا ل مـــەخـــوەش
قـــــۆزیێن چاڤــــــان شکاندن چەپ و راست

وەکـــوو نایێ دســـەمـــــایێ کـــەچ و خـــۆرت
بـلان هـەڤ دکــــــــــــــلانـدن چـەپ و راسـت

دلبــــەر ونەی شــــەکـــەر و ئەبروو کـــــڤـــــان
زۆلف و جــــێنیـک دجــــڤـــــاندن چەپ و راست

تێـن ژ هاویر دەنگێ ســــــازو ناز و کــــــەن
ئەم ل مـــــاسێ دجـــــڤـــــاندن چەپ و راست

ســـورمـــه پۆشـــان دل ڕەڤـــاندن، ســـەرخـــوەشـــان
خـــاچ پەرەســـتـــان دەست پەلاندن چەپ و ڕاست

لاله لێـــڤـــێـن ئەم كـــشـــاندن دەست بدەست
من ل ســـێـــڤـــان دەست پەلاندن چەپ و ڕاست

## ئاگر و پێتا ئەڤینێ

ئەڤین ژ پـێـــتـــا ئاگـــری
هـەردەم ژ بـەر نـال وگــــــری
کی کــــاری جـــارەک هلگری
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئەڤین بـجــــارەک ئار و پـێت
هەرچی کـو پێـتـەک پێـڤـەبێت
بێ هش دبی شـەیدا و شـێت
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

شێرینی پێشی، وەک شەکەر
پێ خـوەش دبن جـان و جگەر
داوی لمن دل کــر دو کــەر
ئاهی ژ دەسـتێ تە ئەڤین

باوەر دکـر تەنهـا ئەڤین
دیدار و هەمـبـێـز وجـڤین
مـاچن ژ لێـڤـێن پر شـرین
ئاهی ژ دەسـتێ تە ئەڤین

هەتا کـو ئەز سـەرخـوەش کـرم
پر هێـڤـی و بێ هش کـرم
سـەرمـەست و پر بێ وەش کـرم
ئاهی ژ دەسـتێ تە ئەڤین

ئەز مـەست و ژار و دین کـرم
وەر گـاور و بێ دین کـرم
بێ خـوەندن و بێ تین کـرم
ئاهی ژ دەسـتێ تە ئەڤین

ئەڤـــینە رەوشـــا دلبـــەرێ
شـێـرین کـەنێ، لیـڤ شـەکـەرێ
ئـاگـــر دنێـــڤـــا جگەرێ
ئـاهـی ژ دەســـتێ تـە ئەڤین

ئـێ دل دتـۆرا دلـبـــــــــەرا
جـان دایە چاڤـێن ئەسـمـــەرا
ئـارمـــــانجێ تـێـــر و ئـاورا
ئـاهـی ژ دەســـتێ تـە ئەڤین

ئەبروو کـــەڤـــانا پۆر شـــەڤی
کـی دل دبەنـدا وێ کـــــەڤی
کـــەنگی دکـــارت راکـــەڤی؟
ئـاهـی ژ دەســـتێ تـە ئەڤین

وێ نـازکـــا شـــەکـــەر ژکـــەن
دا مـن ژرێڤـــــە لـیڤ و چەن
ســـــۆتن لمن وێ جـــان وتەن
ئـاهـی ژ دەســـتێ تـە ئەڤین

ئەڤین ژ پێـــتـــا ئاگـــری
دل گـــرتیـــە قـــەت نامـــری
فـــێـــدە چنە ئاه و گـــری
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

نالین ژبەر داغـــێـن دکـــول
ژان دایە جـــەرگ و ناڤ و دل
لێ، من شکەستن پشت ومل
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

گـــاڤـــا ژ دلبـــەر دوور دبن
برین ددلدە کـــــــوور دبن
سەرمـەست وپر رەنجوور دبن
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

پـــر ئـــاه و پـــر ئـــاواز ددم
پـــەرواز بـــرەنـــگـــێ بـــاز ددم
بســـــەرچیـــــان رە باز ددم
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

گـــەر چ كـــو من بازارە دل
پـێـت و بـرۆسـک و ئـارە دل
پـايتـــــەخت و وارێ يارە دل
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

رادارە دل، دووربـــیـــنـــە ئـەو
یار تێـدە كـەسک و شـینە ئەو
تەحلی لپـــەی شـــێـــرینە ئەو
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

دلبـەر كـو جـارەک بێـتـە بال
داتیـنـی بـەر پێ زێر ومـــــال
ژبیـــر دچن دۆست و هەڤــال
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئاهی ژدەســتێ شـێــرین دەڤێ
شـەكـەر كـەنێ، لێڤ هنگڤێ
ژەهر و مــــــرن بی، من دڤـێ
ئاهی ژ دەستێ تە ئەڤین

ژەهر ژوان لێـــڤـــێـن شـــرین
خـوەش تێ لمن وەک (پەنسلین)
پێ خـــــوەش دبـن دەردو بـرین
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

جـــامـــا ئەڤـــینێ پر بوەش
چاوا ڤـەخـوار ئەز چووم ژ هش
گـەر ئەز مـرم جـانێ تە خـوەش
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئـەڤـــێـن ژ دەســـتێ یاری بت
چەنـدان کـــــو پـر دژواری بت
دێ دل بوێ هشـــیــــاری بت
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئـەڤـین وەکـی ســـــــــازا دلە
نـــالـــین و ئـــاوازا و دلـــە
خـــوەش ڤین و داخـــوازا دلە
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئەڤین ژ چاڤـــــێـن رەش دزێ
بینا بنەفش ونێـــرگـــزێ
وەک شیـــرەیا شـێرین مـزێ
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

جــارەک لدەســتێ دلبــەرێ
شـێرین لەبێ، دێم گـەوهەرێ
دیسـا ڤـەخـوم ئەز وەک بەرێ
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئەو نازکـــا پـر گـــەور و رِند
دێم گـــــــەوهەرا بالا بلند
جــارەک دبی من ئەو لەوەند
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئەز دێ ڤـــەخـــوم پنگاڤی بی
ژەهر و مــــــرن پر ناڤی بی
وەر من مـــرن وێ گـــاڤی بی
ئاهی ژ دەســـتێ تە ئەڤین

ئەم دێ ڤـەخـوین، وەر دین بن
پر ســـەرخـــوەش وبێ دین بـن
جــان و جگەر تەڤ خــوین بن
ئاهی ژ دەســـتێ تـە ئـەڤین

## ئەز خوەش دزانم ڤێ سڕێ

ئەز چوومە ناڤ بەخچێ گولان زانم کو من بەردایە رێ
گوهدارێ دەنگێ بلبلان ئەز خوەش دزانم ڤێ سرێ

ئەڤ رەنگ ودەنگ و ئاڤ ودار، ڤێکرا ل من خوەش کر بهار
ئانینە بەر چاڤێن مە یار کەتمە خەیالا دێم دوڕێ

کەتمە خەیالان هوور و کوور ئاور مە ئاڤێتن ل دوور
ناکا لمن بوو شەوق و نوور دلبەر ژ برجێ دایە رێ

دەرکەت ژ نێڤ برجێ مەشی ئاڤا چەمان قەت ناخوشی
سۆر گول ژ بەر شەرما وەشی ئەز دامە بەربەک ئاورێ

دەستێ مەگرتی خوسرووێ شێرین قەدێ رەش ئەبرووێ
هەیڤێ خوە دا بەر وێ رووێ خوەش داکەتن بنیا پرێ

دەستان ئیشارەت دانە هەڤ هەتا لڤین ئەزمان ودەڤ
رۆژێ خوە بەردا هاتی شەڤ لۆکسا مە روویێ دلبەرێ

شەرما رووێ من زوو رەڤی مێرانیا دل تەڤ جڤی
وەک ڤێ شەڤێ دەست ناکەڤی دەستوور ڤەدا لێڤ شەکرێ

گەه راکەتن گەه رادبوون هشیار دبوون ووندا دبوون
گەه ئەم هەبوون و گەه نەبوون خوەدێ نەکی کو رۆژهلێ

رابوونە پێ ئەم دەست بدەست سووند و گرێبەندێن مەبەست
هێ نوو ژ هەڤ خاتر مە خوەست لێ مان ل سەر سۆزا بەرێ

پشتاخوە دا من و مەشی جۆبار ل چاڤێن من خوەشی
پێل دان جگەرخوین ژێ کشی دژوارە دەربا خەنجەرێ

## مزگین

مزگین ل دل بوویە بهار گول پشکڤی دەرکەت ژ خوار
بلبل بگول رە بوو هەڤال دل نوو ژ خەو بوویە شیار

گاڤا مە مزگین دایە دل، تێدە نەمانە دەرد وکول
رابوو ژ خەو هات پێشی گول پێچان ل خوە چار وخومار

سەد ئافەرین بو ڤی دلی، ئێریش برە دێمێ گولی
چارک ل بەژنێ حەربلی هاتن سەما بسک وگوهار

بسک و گوهار هاتن سەما ، ئەپری ل سەر زولفا نەما
دلبەر ل بەر من هەر وەما ، دنیا ل من بوو دووست ویار

سەد ئاه ژوان چاڤێن درەش، بسکێن سیاه دێمێ دگەش
وان گوتنێن شێرین و خوەش ،شەربەت ژ لێڤان من ڤەخوار

شـەربەت ژ لێـڤان من مـژی هەتا کـو دل ژێ بوو تژی
قـەت ئاگـری دل ناکـوژی پێـتـی ل دل دان بـوو هەوار

من دیم و گـەردەن گـەزکـرن، خـالان بتـالان من برن
دەستـان مەمک تالان کرن، ماچان ژ هەر دەربێ ژمار

پیـشـی ب رەمـز و نازنا، جـەنگ بـوو ب کولـم وبازنا
پاشێ بلاڤ وگـازنا، وەک روسـتـەم و ئەسـفـەندیار

ماچەک ژ لێڤان من ستاند، دەردێ ل دل من پێ رەڤاند
دەستێ مە گرت ونوو هەژاند، گو: سەرسەرا ئەی شەهسوار

رابوومە پێ خاتر مە خوەست، قۆلان وکەمبەر زوو ڤەبەست
ئەم هەردو گەردەن خوار و مەست پێتا ددلدە نابە سار

قەهوا شێرین لێڤێن شەکر دا مـن ل من دەرگەهـ ڤەکر
دەردێ دلێ من زێدەکـر دیسـا جگەرخـوین مـایە ژار

## لاڤ لاڤ چنه

فــــەلەک دەســـــتێ خـــوە نادی کـــەس بلاڤــا
نە وەک کــــەو تێـــتـــه گـــرتن ئەو بداڤـــا

نـه ئـاهـوويـه ژ دوور ڤـــــــه لـێ بـنـێـــــــــرم
نه کــــــیـــــرگـــــۆیه کـــو بـگرم وێ براڤـــا

کــــــــەچێ بـۆچ ژ بـۆ مـن ســــــــەرگــــــــرانی
وەکی هەڤــــــدینه هەر دوو ئـەم ببـــــاڤـــــا

ته گـــــۆتـی من ئەگـــەر جـــارەک تـو بێ ڤــــر
ئەمێ روونـن لـپـــــشت پەردێ دوو گــــاڤـــــا

هـەیه دەه ســــــــال لـبـــــــەر دەر ئـەز دنـالـم
تـو نـابێـــــژی بەســــــه مـــــالا ته ئاڤــــا

ژ من جانێ شرین گەر تو دخوازی
ژ من بستین ببە سەر هەردوو چاڤا

ژ دەستێ تە سپی بووم، بوومە وەک کاک
دگەل بلبل دنالم ئەز ل ماڤا

مەگۆ بەلکی دبورجا شانەشینێ
ئەمێ روونن دکنجێ بووک وزاڤا

بڤان خاپان تە ئەز کرم جگەرخوین
بەسە ئیدی فەلەک مالا تە ناڤا

## گازن ژ كێ

ئێـــــــــــرۆ ژ بـەر ژانـا ددل
دل ژار و مـەست وخـەسـتـەیە
ئاگــر ل ســەر داغێ دكــول
بێ گـــازن وبێ لۆمـــەیە

مـــادێ ژكێ گـــازن بـكم
گـــــــازن ژ بـەر بـازن بـكم
دەردێ ل دل مـــــازن بكم
چەندان بكم بێ فــێــدەیە

بێ فــێـــدەیە ئەڤ نالە نال
بۆرین ل مـن پر مــاھ وســال
دلبـەر ل بەر چاڤـێن خـیـال
لەورا ئەڤین یـەک نوقــتـەیە

نوقـــتـــا ئەڤـــینێ ئاتەشی
لاشێ کـو پێـتـەک تێ کـشی
کـەنگی دبینت ئەو خـوەشی
مـــا کی نزانـی ئەڤ وەیە

زانم ئەڤین پر شـــەوق وتاڤ
پـــەیـــدا دکـــی ژانـــا زراڤ
سینگا کو پێتـەک چوویە ناڤ
وەک مووم وفند و لوکسێ ھات

## باغێ شەهبالێ پەری

نازکا من هاتە خوارێ
دایە هندور شەوق وتاڤ

خانی داگرتی ژ بینێ
نێرگز و مسک وگولاڤ

بوو بهەشت ومێرگ وگولشەن
چیچەک وگول پشکڤین

باغێ شەهبالێ پەری بوو
پادی شاهم ئەز دناڤ

دامه دەستێ گەور ونازک
کو ب گەرمی من گڤاشت

هەردو چاڤان تیر رەشاندن
سۆرە لێڤان کر سلاڤ

من دبەرسینگاخوە دا
ئانی سەری بەردایە سەر

ئەز بچاڤان لێ دنێرم
بەژن وبالا پڕ زراڤ

سحرە بازن هەردو چاڤێن
رەشبەلەک ئاور ڤەدان

روو وەکی بەرفا زناران
بسک ل هاوێر بوونە داڤ

لێ چەن ولێڤ وکەپوو
ئەلماس ولال وگەوهەرن

سێڤ دسنگێدە بلندن
نووگهانە گەور وخاڤ

کەتمە گۆمانێن دکوور
پێلان ل من دان بوون لەهی

خوەش دبەر پێلان دچم
لێ کی دزانی، ئاڤ وئاڤ

من ژ لێڤان شەربەتا
سێڤان ڤەخواری دەڤ ب دەڤ

زولف وبسکێن مسک وتاری
لێ شکەستی هەردو چاڤ

هەورێ گۆمانان بەلاڤ بوو
ترس وساویر قەت نەمان

یار ب چاڤێن رەشبەلەک
ئەز زوو گهاندم بەر دەلاڤ

ئەز گهام بەر ئاڤ و دەشتێ
کەتمە نێڤ باغێ بهەشت

ئوخ، ل جانێ من چ خوەش تێ
دێ چکم زێرو دراڤ؟

بەخچەیێ میرێ جنایە
دل بترس ئەز پێدە چووم

وێ، ل من دەرگەه ڤەکر
ما وێ چ بێژن دێ و باڤ؟

گو: جگەرخوین، بۆچ مەستی
دل بترس و شەپرزە؟

ما گەلۆ، وێ بێنە دەستێ
مە هەرۆ ئەڤ پێل وگاڤ.

## دیارییا یارێ

ژ دۆستێ ره‌ چ رێکم ئه‌ز دیاری
دیاره‌ یار دخوازی من بیاری

دخوازم جان ودل ژێره‌ بشێنم
ته‌نێ شه‌رمه‌، هه‌می ده‌ردو هه‌ژاری

دخوازم هه‌ردو چاڤان ژێره‌ رێکم
بکێر نایێن، ژوان هه‌ر خوین دباری

دڤێم ژێره‌ زمان وده‌ڤ بشێنم
نه‌ هێژانه‌ شه‌ڤ و رۆژان ب زاری

نزانم ئەز، چ هێژایە کو رێکم؟
جیهان پێکڤە بهایێ بسکێ تاری

سەری ناچارە من دانی ل بەر پێ
مە گو: شاهم، تو پێلێکە سواری

تەنێ خانم ب نازی هاتە سەرمن
زڤستانە ل من شین کر بهاری

بـ وان لێڤێن شرین گو: رابە سەیدا!
تو سەربەستی ژ من چبکی، دکاری

ژ رێڤە ئەز بەزیمە پێ و دەستان
بـ ژۆر ڤە هلکشیمە ئەز ژ خواری

ژ بەخچێ پاخلێ چوومە دو سێڤان
ژ بستانێ رووان دیمێن هەناری

ژ لێڤێن ئەرخەوانی من دوسەد جام
شەرابا هنگڤینی، نوو ڤەخواری

ب دەستێ خوەی سپی ئەز کرمە هەمبێز
وەکی پۆلا حەلاندم ئەز ب ساری

مە هەردو دەست ل بەژنێ بوون حەمایل
بـ بەر پێلان کەتن رەش بسک وچاری

مەتالانەکر بەر وبستان بجارەک
کەنی وگو: بەسە رابە هەساری

مەگو: گۆری جگەرخوین بوو دڤێ رێ
بـ دەست نایێن وەکی ئیرۆ تو جاری

## داغێن سینگێ

دیســــــا ژ بەر ژانا ئـەڤین
مـن تێـن ژ دل ســەد ئاخ وئۆخ
داغــێـن ل ســینگێ ئاخــڤین
هەر ژێ دزێـتن خــــوین وزۆخ

خــوین تێ ژڤــان داغــێن دکــول
کــەرکــەر دبت مــێــلاک و دل
دشـکێـن لمـن تـەڤ پشـت ومـل
گاڤا کو تێ ئەو شەنگ و شۆخ

شــۆخ قــامــەتێ وێ ســاعــەتێ
دا من نــیــشــان خــال وخــەتێ
گــاڤــا مــە دی بـوو دل کــەتێ
من ســەجــدە بر ئەبروو و رۆخ

ئەبروو قــەزەح، چاڤــێن قــەدەح
من پێ دکــر کـــێف وفـــەرەح
بەژنا زراڤ مـــســک وگـــولاڤ
خــەفــتــان بســەردە شــال وچۆخ

خــەفــتــان ل بەژنێ چۆخ وشــال
ســەد رســتــەم وفــەرهاد وزال
وێ نــازکــــــا رِنــد ودەلال
کــوشــتــینە هەریەک ئەو بدۆخ

ســەد دۆخ ل ســینگێ خــســتــنە
مـــێـــلاک ودل دەرخـــســـتــنە
زنار وکـــەمـــبـــەر بەســـتــنە
لێ راکـــشـــاندن تیـــر وهۆخ

پر تیــر وهۆخ وێ لێ کـشــاند
ئـاگــر بســـەردە لێ رەشـــاند
تیــرا کـەڤـانێ رەش وەشــاند
دانی جگەر، خـوین بوو کولۆخ

## تەماشا دلبەر

دلبـــەر گـــەلەک دەلالە، یاشـــا دەلالێ یاشـــا
وەک تە هەبن شـەپالە، سـەد حـاشـا "ئم" حـاشـا

دپەسنێ گــــەور ورندی، چەلـەنگ وپر لـەوەندی
خـوەسـرویێ سـەربلندی، سـەردارێ مـیـرو پاشـا

رۆ کــــــەهرەبا ورۆژی، پەرتـاڤـێ دل دســــۆژی
ئـاگـــــر دکــــونج و دۆژی، ژانا زراڤ دلاشــــا

ســـادە ژ رەنگێ ئاڤی، شـــێـــرینی وەک دراڤی
گـەراڤی نەوق زراڤی، ســـەرتیپ و گـەور وپاشـا

چین چینە زولف و رەیحـان، ئەنی تاجا شـەرەفـخـان
ئەبروو کـەڤـان و ئەیوان، روو گـەلگەشـە دکـاشی

چاڤــێن درەش ســتــێــرن، کــەپ وچلاک وشــێــرن
ســـەدەف دران وزێرن، زمـــان قـــەلەم تراشـــا

چەن گەور وبسکێ رەش قەر ئەلماس گوهار و گەوهەر
گـەردەن بەلۆر و مـەرمـەر، سـینگا سـپی قـومـاشـا

مـــەمک ســـــپی بلندن، بەژن بگولک وبەندن
سـەر پێـچی مـوم وفندن، یاقـووت ودر دقـاشـا

چاک وچەلەنگ وبەنگین، خەفـتـان بسـەردە رەنگین
ئەی سـەیدایێ جگەرخـوین، دە فـەرمـۆ وەر تەماشا

چاڤــێن درەش ســتــێــرن، کــەپ وچلاک وشــێــرن
ســـەدەف دران وزێرن، زمـــان قـــەلەم تراشـــا

چەن گەور وبسکێ رەش قەر ئەلماس گوهار و گەوهەر
گـەردەن بەلۆر و مـەرمـەر، سـینگا سـپی قـومـاشـا

مـــەمک ســـــپی بلـندن، بەژن بـگولـک وبەندن
سـەر پێـچی مـوم وفندن، یاقــووت ودر دقــاشــا

چاک وچەلەنگ وبەنگین، خـەفـتـان بسـەردە رەنگین
ئەی سـەیدایێ جگەرخـوین، دە فـەرمـۆ وەر تـەمـاشا

## بـ تۆرە بخوینە ڤێ نامێ

وەرە بایێ سپێدێ خوەش
ژ دەستێ من بگرە ڤێ نامێ

بدە دەستێ سپی زەندێ
شەککەرخەندێ، بلندقامێ

ب زانین و بـ تۆرە خوەش
بخوینە نامەیێ ژێرە

دبی ناڤێ مــه بێــتــه ســەر
زمـــانێ شـــاهە بەهرامێ

ببـــێـــژە: گـــرتیێ بسكێ
تـــە تم ژارو بـــریـــنـــداره

رهـــا وبـــەنـــدەواره ئـــەو
قـــەلابەندە دنێڤ شـــامێ

دخـــوازی پرســـەكێ لێكی
ژویره بەرســــــڤێ رێكی

ژوان لێڤ ودەڤێ شـــێـــرین
بشـــێنە ژێره پەیخـــامێ

ل ژین و رەوش و پەرگـــــالێ
بپـــرســـە جـــارەكێ ســـالێ

ببـــێـــژە كـــو شـــەڤ و رۆژان
ژ تە دســـتـــێنی ئیلهـــامێ

دزیندانێـــده رِوونشــــتی
دکی گـــاز وگلی هەردەم

کـو دنڤـیـسی ب خـوینا دل
ل هـەر دیـوار وهـنـدامـێ

ئەگـەر بێـژی چیـە داخـواز
کـــــەسێ ژارو بـریـنـداره

ببـێـژه کـو دڤێ جـارەک
ژڤان دەستان ڤەخوی جامێ

ل سـەر ئاڤـان، ل ناڤ باغـان
ڤەخون مەی، گوه بدن زاخان

درسـتـە چەنگەک ژ ئاخـا بەر
دەرێ دلبــەر ب بۆسم ئەز

ژ دەرێ منرە دێ خـــوەش بێ
گـەلەک بێـتـر ژ پەرشـامێ

ئەگــەر دلبـــەر دخـــەودا بێ
ب نەرمی بگرە ســەردێمــان

خــوە بەردەســەر دەڤ ولێــڤــان
ئو وان دێمێن وەکی سێڤان

تو رامــووســە، ســەلاڤــێن من
بدە وێ شـــۆخ و دۆمــــانێ

ژوان لێــڤــێن شــرین جـارەک
ژ بۆ مـن پرســــــەکێ بینـه

دنێڤ لیـــــزا ئەڤـــــینێ دە
دو بەرکــێن من هەرن دامێ

دبی ئەو شـاه وکـەیخـەسـروو
بجــــارەک من بـکی ئازاد

کــو ســەر دەینم ل بەر لالەش
بکم هەی، هەی دهنگامێ

دەرێ مەیخانەیێ روونم
مەیێ فرکم ب سەربەستی

ل سازێ گوهـ بدێرن ئەم
بکن نالین دگەل خامێ

جگەرخوین شاهـ وخونکارە
کو جارەک دەست بدی یارێ

ب هەڤرە هەرنە سەیرانێ
بـ ڤێ تەکتیک وبەرنامێ

## ئەڤینا دل

ئەڤینا دل تە دل کریە بریندار
بهارا من، هەمی زەر بوون گول و دار

مە ئەو رۆژێن جوانی دان بتولک
کەتم هەشتێ، ژ نووڤە بووم ئەڤیندار

دران و چاڤ و دل پێکڤە شکەستن
ئو پورێ من سپی بوویە بیەک جار

بهەر چاران دبی خۆرت و دبی پیر
ژ بۆنا من نەما هێژانە هەر چار

جیهان پێکڤە دچاڤێ من دە خوەش بوو
نها ، پیرم، دچاڤێ من دە بوو سار

شەڤا رەش پەژ ڤەدانە هاتە سەر من
کو رۆژا من لبەر ئاڤایە، ئێڤار

جوان بووم ئەز بدۆست و یار و کەس بووم
کو پیر بوومە ، هەمی کەس بوونە نایار

ئەڤینا من وەکی هەسپێ چەلنگە
رەڤاندم ئەز، نە زەنگە و نە هەڤسار

ل کوو دمرم، دچم کوو، ئەز نزانم
دەما دمرم ئەزێ چبکم بـ (هەسار) ؟

کەتم هەشتێ و سەر ژێر بوومە دەشتێ
نە ئەو لات و نە ئەو هیم و نە ئەو دار

